


# تحقيق الاجرامي

# لێکۆڵینەوەی تاوانی

کۆمیتەی خوێندکارانی یاساو رامیاری

سمان کارمەند فریق



# كشف الدلالـــــــــة

**كشف الدلالە :** واتا بردنی تۆمەتبار بۆ شوێنی ڕوودانی تاوان لەلایەن لێکۆڵەرەوە، بۆ ئەوەی بزانێ ئەم تۆمەتبارە تاوانەکەی ئەنجام داوە بەشێوەیەکی تێرو تەسەل تاوەکو دڵنیابێ لەقسەکانی ئەم تۆمەتبارە.

ئەم پڕۆسەیە پاش ئەنجام دانی ( الکشف ) و پاش دان پێ نانی ( اعتراف ) ی تۆمەتبار دەکرێت، چونکە هەروەك دەزانین، اعتراف کردنی تۆمەتبار مانای ئەوە نییە کە ئەو تاوانەکەی کردبێ، چونکە دانپێنان ڕەنگە ڕاست بێ و ڕەنگە ڕاست نەبێ، دەیەوێ دوژمنێکی خۆی بەشدار بکات و لەدانپێنانەکەدا دەڵێ من و ئەو ئەو کارەمان کردووە، یاخود دەیەوێ ئەم تاوانە لەسەر کەسی ڕاستەقینە ( تۆمەتباری ڕاستەقینە ) لابدات و خۆی بە ئەنجامدەری ئەم تاوانە دابنێ.... هتد.

جا ( کشف الدلالە ) ڕێگەیەکە کە بەهۆیەوە لێکۆڵەر دەتوانێ لەڕاستی و ناڕاستی دانپێنانی تۆمەتبار بگات.

**بۆنمونە :** - لە تاوانی دزینی لەماڵێك: لێکۆڵەر پرسیاری و ڕوونکردنەوە ناڕاستەی تۆمەتبار دەکات لەسەر چۆنییەتی چوونە ناو ئەما ماڵە و چۆنیەتی هاتنە دەر لێی، ئەو شوێنەی کە شتە دزراوەکانی تیایدا دزییوە، ئەو ئامێرانەی کە بەکاری هێناوە، شوێنی شاردنەوەی شتە دزراوەکان، ئەگەر هاتوو هاوبەشی ( شریك ) هەبوو ئەوا پرسیاری ڕۆڵ و هەڵسوکەوتی ئەم هاوبەشانەی لێ دەکات لەکاتی چوونە ژوورەوە هاتنە دەرەوە لەم ماڵە.

جا گشت ئەم زانیارییانە بەشێوەیەکی تێروتەسەل لە محزەرەێك باس دەکات کە پێی دەگوترێت( محچر الکشف )، وە دەبێ لە شوێنی ڕووداوەکە ئەم محزەرە بنوسێت، پاشان لە خوارەوە واژوو دەکرێت لەلایەن لێکۆڵەرەوە تۆمەتبار و ئەوانەی ئامادەی ئەم پڕۆسەیە بوون.

## کشف الدلالە دوو مەرجی هەیە :

1- نابێ تۆمەتبار زانیاری هەبێ لەسەر شوێنی ڕوودانی تاوانەکە پێش ئەنجامدانی تاوانەکەی، چونکە ناکرێ ئەم جۆرە کەشفە بکرێت لەسەر تۆمەتبارێك کە سروشت و حاڵی ئەم شوێنە لە پێشەکی دا بزانێ.

2- دەبێ دەست پێشخەری لەسەدەست نیشان کردنی شوێن و حاڵەتەکان لەکاتی ( کشف الدلالە ) لەدەست تۆمەتبار بێ، واتا دەبێ ئەو شوێنە چوونە ژوورەوە و هاتنە دەرەوە و چۆنییەتی ئەنجامدانی تاوانەکە دیاری بکات لەگەڵ گشت وردەکارییەکانی تر، و نابێ لێکۆڵەرە هیچ شتێك لەخۆیەوە بڵێ یان دیاری بکات،




بەڵکو ڕۆڵی لێکۆڵەر تەنها داوای ڕوونکردنەوە( استفسار ) بێ و نەگاتە ئاستی وەڵامدانەوە و وریاکردنەی حاڵەکەتەکە بۆ تۆمەتبار جا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکان

( بۆنمونە : بڕوانە ئەو نموونەیەی کە لە پەرتوکەکەتا باس کراوە لەلا پەڕەی ( 60 ) )

هەروەها بڕاوانە نمونەیەك لە ئەنجامدانی ( کشف الدلاله ) لەلا پەڕە ( 61 ) لە پەرتوکەکەتان.

## حاله تهدد التمهمين فى حادپ واحد :-

(1) حالة تهدد التمهمين في حادث واحد وە ئەگەر هاتوو زیاتر لە تۆمەتبارێك هەبوو لەیەك تاوان، بۆ نموونە سێ کەس دزیان کرد لەماڵێك لێرەدا دەبێ(محضر )ێکی تایبەت بۆ هەریەکێك بکرێتەوە، تیایدا ڕوون بکرێتەوە کە کامەیان ڕۆڵی تۆمەتباری سەرەکی بینیوە و ڕۆڵی ئەوانی تر چۆن بووە وەکو هاوبەش(شرکاء) ،ئینجا یەکە یەکەیان دەبردرێن بۆ شوێنی ڕوودانی تاوانەکە بەتەنهایی(منفرد) ، نەوەك قسەکانیان یەکبخەن، وە پاش تەواو بوونی ئەم پڕۆسەیە سەر لەنوێ(محضر ) ێکی بەکۆمەڵ (جماعی) ڕێك دەخرێت بەئامادەبوونی گشت تۆمەتبارەکان لە شوێنی ڕوودانی تاوانەکە، جا هەریەکێکیان ڕۆڵی خۆی دیاری دەکات و ( دەورەکەی ) پیشان دەدات.

جێی ئاماژەیە دەبێ قسەکانی تۆمەتبار لەکاتی نووسینەوەی (محضر )ەکە بەشێوەی (الضمير الغائب) بێ، بۆنمونە : دەنوسرێت (پاشان ژورەکەی جێهێشت) (غادر الغرفة) (چووە دەرەوە لە پەنجەرەکە) (نخرج من الشباك) ... هتد.

(2) حالة تعدد محل الحادث:- وەئەگەر هاتو زیاتر لە شوێنێکی ڕووداوی تاوان هەبوو، بۆنموونە : کەسێك دزی کرد لەماڵێك و شتەدزراوەکانی ( بۆنمونە ملوانکەیەکی زێڕ ) لەناو باخچەی ماڵەکەی تر شاردەوە ،یان کەسێکی کوشت و لەشوێنێك لاشەکەی گواستەوە و شاردیەوە لە شوێنێکی تر.

لێرەدا دەبێ زیاتر لە (کشف الدلالة) یەکی بۆبکرێت ، وە بۆ هەر شوێنێك لەم شوێنانە (کشف الدلالة) بکرێت و بە پێی ژمارەی تۆمەتبارانیش ئەگەر لەیەك تۆمەتبار زیاتر بوو.








## ووێنە كێش كردنی شوێنی ڕووداو

## تنظيم وترسم لمحل الحادث

مەبەست لە وێنەكێش كردنی شوێنی ڕووداو، دیاری خستنی شوێنی ڕوودانی تاوانەكە و دیاریكردنی موقع و دوور و نزیكی و هەرشتێك كە پەیوەندییەكی ڕاستەوخۆی هەیە بە شوێنی ڕوودانی تاوانەكە، بۆ ئەوەی بیرۆكەیەكی ڕوون و ڕاست ببەخشێت بە لێكۆڵەر سەبارەت بە كەسی تۆمەتبار و چۆنییەتی ڕوودانی تاوان.

لە پاڵی ئەم وێنە كێش كردنە واباشترە كە ( وێنەیەكی فۆتۆغرافی ) ئەم شوێنە بگرێت، چونكە هەردووكیان ( واتا وێنەكێشكردن و وێنەی فۆتۆغرافی ) وێنەیەكی ڕاست و دیار دەبەخشێ لەسەر بابەتی تاوانەكە، چونكە وێنەی فۆتۆگرافی وێنەیەكی گشتی دەدات لەسەر شوێنی تاوانەكە، بەلام وێنەكێشكردنی لایەك (الاتجاه ) و نێوان ( المسافه ) و قەبارەی شتەكان دیاری دەكات.

جا پێویستە لەسەر لێكۆڵەر لەكاتی وێنەكێش كردنی بەنەخشە(رسم مخطط) ڕەچاوی ئەم خالانە بكات :

### القواعد العامة في تنظيم المرسم:-

1- دیاری كردنی شوێنی ڕووداوەكە بە پێی (الجهات الأربع)

2-دەبێ گشت پێوەرەكان ( المقاييس ) یەك بن، بۆ ئەوەی جیاوازی لەنێوان ڕوونەدات ، بۆنموونە :- نابێ پێوەری ژوورەكان ( الغرف ) بە مەتر دیاری بكرێت و پێوەری ئەو كەرەستانەی كە لەناو ئەم ژوورە دایە بە ( پێی ڕەقەم ) دیاری بكرێت.

3- دەبێ پێوەركان زۆر بەووردی دیاری بكرێت، واباشترە لێكۆڵەر خۆی ئەم كارە بكات و پشت بەكەس نەبەستێت لەئەنجامدانی ئەم كارە.

4- دیاری كردنی پێوە لەسەر بنەمای پێویست بوونی شوێن و پانتایی شوێنەكە، ئینجا دیاریكردنی قەبارەی ئەو ( ورقە ) یەیی كە بەكاردێت بۆ ئەم مەبەستە.

5- درووست كردنی وێنەكێشەكە بەتەواوەتی لە شوێنی ڕوودانی تاوانەكە، چونكە سروودی زیاتر دەگەیەنێ، چونكە لەم شوێنە شوێن و مەوداو ناوەڕۆكی ئامادەیە.

6- دەبێ ئەم وێنەكێشە بە نەخشەیە لە پەڕێكی سەربەخۆ( ورقة مستقلة ) دروست بكرێت، بۆ ئەوەی هەركاتێك پێویست كرا بەكاری بێنێ.




7-هەندێ هێمای ڕوونکردنەوە (رموز ایضاحیة) لەخوارەوەی پەڕەکە بەکاربێت بە شێوەی پیت (حروف) یا ژمارە(أرقام) بۆنموونە : ووشەی ( لاشە ) ژمارە ( 1 ) یان پیتی ( ل ) بۆ دیاری بکرێت، ووشەی ( خوێن ) ژمارە ( 2 ) یان پیتی ( خ ) بۆی بەکار بێت

8- لەکاتی وێنەکێش کردنی بەنەخشە، ئەو شتە دوور دەخرێنەوە کە پەیوەندیان نیە بەشوێنی ڕوودانی تاوان.

9- دەبێ وێنەکێش کردنەکە ناونیشانی هەبێ( عنوان ) کە تیایدا ناوی شوێنەکە و ڕێکەوت و کاتی ڕێکخستنی ئەم وێنەکیش کردنە دیاری بکرێت، هەروەها ناوو واژووی ئەو لێکۆڵەرەی ئەم وێنەکێش کردنەی دروست کردووە.

10- یوچع بالرسم مقیاسه

## پێکهاتەی وێنەکێش کردن

## (محتویات المترسم)

دەبێ وێنەکێش کردنی بەنەخشە ئەم پێکهاتانە لەخۆبگرێت: -

**یەکەم : شوێنی تاوان** (مكان الجريمة) :- واتا وێنە کێشکردنی دیمەنی گشتی شوێنی ڕوودانی تاوانەکە و ئەو خانوو ڕێگایانەی کە بەدەوری ئەم شوێنەوەن.

**دووەم : پێگەی تاوان** (موقع الجريمة) :- واتا وێنە کێش کردنی ئەو خاڵەی کە(موقع الجريمة) کە تاوانەکەی تیایدا ڕووی داوە لەگەڵ گشت پێکهاتەکانی و شوێنی دۆزینەوەی لاشە.

**واتا** : پاش ئەوەی لێکۆڵەر وێنەکێش کردنی نەخشەی گشتی شوێنی ڕووداوی تاوانەکە دەکێشێ، ئینجا دێتە سەر دیاریکردنی ئەو جێگایەیی کە تاوانە ڕاستەوخۆکەی تیادا ڕووی داوە، بەشێوەیەکی تێر و تەسەل، وەکو دیاریکردنی درێژی و پانی ژوورەکە، قەبارەی دیوارەکان، دیاریکردنی دەرگا و پەنجەرەکان ... پاشان دێتە سەر پێکهاتەی کەرەستە (أثاث)ی ناو ژوورەکە ، وەکو سیسەم ، دۆلاب .... هتد ، پاشان دێتە سەر دیاریکردنی شوێنی بەڵگە جێماوەکان، وەکو خوێن ، فیشەکی بەتاڵ، ...هتد ، لەگەڵ ڕەچاو کردنی دووری و نزیکی لە بابەت سەرەکیەکەی تاوان ( بۆنمونە لاشە ، قاصه ...).




**سێیەم : بابەتی تاوانەکە** (جسم الجريمة):- واتا لاشەی مردووەکە، یان قاصە شکاوەکە ،،، هتد. جا دێتە سەر وێنەکێش کردنی شوێنی ئەم لا شەیە، هەروەها شوێنی ئەصلی ئەم لاشەیە ئەگەر هاتوو گوازرابۆوە، هەروەها هەرچییەکی لەسەر بێت و لەتەنیشتی بێت یان هەر ئاسەوارێك، ئەوا دەبێ لە وێنەکێشەکە دیاری بکرێت.

## دووبارە کردنەوەی ڕوودانی تاوان

## (اعادة تكوين الحادث)

مەبەست لێی ، بەستنەوەی ڕووداوەکانی تاوانەکە و گەڕان بەدوای زنجیرە وون بووەکان (الحقات المفقودة) ئەوانەی جێگای گومانن، وەکو وون بوونی و نادیاری هەندێ ئاسەوار یان ئەو شتەی کە تاوانبار جێی هێشتوە، یاخوود هەندێ جار جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو قسانەی کە تۆمەتبار دەیکاو و ئەو تاوانەی کە کردوویەتی.

**ئەم پرۆسەیە بە دوو ڕێگا دەکرێت :-**

**یەکەم :-** ئەو تۆمەتبارەی کە ڕەتی ئەوە دەکاتەوە کە تاوانی کردبێ، بانگهێشت دەکرێ بۆ شوێنی ڕوودانی تاوانەکە تاوەکو لەم شوێنە گفتوگۆی لەگەڵ بکرێ ( **استجواب** ) ، چونکە لەهەندێ ڕووداو دەرکەوتووە ئەم ڕێگایە کاریگەری زۆری هەیە لەسەر دەروونی کەسی تۆمەتبار و وای دەکات کەدان بە تاوانەکەی بنێ.

**نموونەیەك:** ژنێك بەناوی ( أ ) ئاگاداری بنکەی پۆلیسی کردەوە کەوا مێردەکەی کەناوی ( ب ) بوو بزر بووە، پاش گەڕان و لێکۆڵینەوە ، دەرکەوت کەوا ( ب ) لەڕۆژی بزربوونی لەگەڵ کوڕە مامەکەی بینراوە کەناوی ( ج )بوو، پاش پرسیارکردن لێی سەبارەت بە( ب ) ووتی من بەهیچ شێوەیەك ئەم کەسەم نەبینیوە و نکوڵی کرد و بەردەوام بوو لەسەر ئەم نکوڵی کردنەی هەرچەند شایەد هەبوو کەشایەدی دا کەوا هەردووکیان پێکەوە بینیوە.

ئینجا لێکۆڵەرەکە ( ج ) بردە شوێنی ڕووداوەکە کە ( **ئاشێك** ) بوو لەم شوێنە دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لەگەڵی و استجواب کردنی، جا لەکاتی نزیك بوونەوە لەم شوێنە وورده و هێزی ( ج ) بەتەواوەتی ڕوخاو دانی بە تاوانەکەی دا نا کە تاوانی کوشتنی ( ب ) بوو، چیرۆکەکەی گێڕایەوە کەئەو تاوانەی کردووە چونکە پەیوەندیەکی سۆزداری هەبووە لەنێوان خۆی و ( أ ) واتا ژنی مردووەکە، وە ئەم ( أ ) هانی دوە ( **تحريج** ) کەوا مێردەکەی بکوژێت و لەسەر بنەمای ئەم هاندانە ئەو سەم کارەی کردووە.






پاشان شوێنی شاردنەوەی ئەو چەقۆیەیی کە تاوانی کوشتنەکە پێ ئەنجام دابوو نیشانەی لێکۆڵینەوەکەی دا کە لەژێر بەردێکی گەورە حەشاری دا بوو.

**دووەم :-** زانینی ئەو ڕێگایەیی کە تاوانەکەی پێ ئەنجام دراوە. هەروەها دەستنیشان کردنی ئەو هەنگاوانەی نراوە یەك لەدوای یەك بۆ ئەم تاوانە. چونکە زۆرجار تاوانبار تاوانبار هەوڵدەدات گشت ئاسەوارەکانی تاوان لەناو ببات و بیانشێوێنێ.

لێرەدا توانای لێکۆڵەر دەردەکەوێ کە چۆن بتوانێ وێنەیەکی تەواو لەسەر چۆنیەتی ڕوودانی تاوانەکە دیاری بکات. ئەمەش تەنها لەڕێگەی کۆکردنەوەی گشتی شتە سەرەکیەکان دەبێ. تاوەکو بتوانێ هەنگاوە یەك لەدوای یەك دیاری بکات و ببێتە زنجیرەیەکی بەیەك بەستراو وەکو ڕووداوێکی ڕاستەقینەی لێ بێت. ئەمەش بە ڕەچاوکردنی ئەمانەی خوارەوە :-

1-گەڕاندنەوەی شوێنی ڕوودانی تاوان بۆ ئەوبارەی هەبووە. واتا شوێنی ئەصلی خۆی پێش ڕوودانی تاوانەکە.

2- پاشان دەستکردن بە هەندێ تاقیکردنەوە و ئەنجامدانی گۆڕانکاری لەسەر ئەم شوێنە کە ڕوویداوە لەکاتی ڕوودانی تاوانەکە. بۆ ئەوەی بۆمان دەرکەوێ کە کامە زنجیرە وونە (الحلقة المفقودة) لەم تاوانە پاشان ئەم تاقیکردنەوانە ئەم گۆڕانکاریانە بەراورد دەکرێن لەگەڵ یەکتر. تاوەکو بتوانین ئەو زانیارییە تازانە کە دەردەکەون دیاریکرێت لە قۆناغەکانی ڕوودانی تاوانەکە. چونکە ڕەنگە ئەو ڕاستیانەمان دەست نەکەوێت بەکەشف کردنی یان بە (کشف الدلالة). بەتایبەتی لە هەندێ تاوان وەکو کوشتن و دزی.

**بۆنمونە :** لەکاتی ڕوودانی تاوانی دزین. ماڵە دزراوەکە (هاوشێوەی ماڵە دزراوەکە) لە شوێنی ئەصلی خۆی دەدەنرێتەوە. وەگشت شوێنەکان وەکو خۆی دادەنرێتەوە پێش ئەوەی دزەکە دەستکاری بکات. ئینجا کاری تاقیکردنەوەی پرۆسەی چۆنییەتی دزی کردنەکە دەست پێ دەکات لەڕووی چۆنییەتی ڕوودانی ئەم تاوانە لەلایەن تاوانبار (کە کەسێك ڕۆڵی ئەم دزە دەبینێ) بە ڕێگای هاتنە ژوورە ئەو ئامێرە و کەرەستانەی کە بەکاری هێناوە. هەروەها ئەو ئاسەوارانە و ئەو خوێنەی کە جێی هێشتوە لەم شوێنە .... گشت ئەم نواندنە (التمثیل) ئەنجام دەدرێت پاشان بەراوورد دەکرێت لەگەڵ ئەو تاوانەی کە بەڕاستی ڕوویداوە.





## گەڕاندنەوەی تاوانبار بۆ شوێنی تاوان

## (عودة المجرم الى محل الجريمة)

تاقیکردنەوە لێکۆڵینەوەکان دەریان خستووە، کە هەندێ لەتاوانباران بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە یەکەم جارە تاوان ئەنجام دەدەن و تاوانەکەیان زۆر مەترسیدارە وەکو تاوانی کوشتن بۆنموونە، پاش ئەنجامدانی ئەو تاوانە بۆ ماوەیەکی کورت بۆ نموونە یەك یان دوو ڕۆژ، دەگەڕێنەوە بۆشوێنی ڕوودانی تاوانەکە، وە ڕەنگە هەندێ جار ئامادەی ناشتنی تەرمەکەشی بێت !!

زانایانی بواری سایکۆلۆژی تاوانکاری (علم النفس الجنائي) ئەم دیاردەیە بەوە شی دەکەنەوە: مرۆڤ هەندێ جار لەژیانی تووشی پێکدادانی دەروونی (صداع نفسي) لەناو خودی خۆی، ئەم پێکدادانە وای لێدەکات هەندێ ڕەفتاری دوژمنکاری ئەنجام بدات زۆر جار تووشی ئەنجامدانی تاوان دەبێ، چونکە مرۆڤ بەگشتی دوو پاڵنەر کاریگەری دەکەنە سەر هەڵ و کەوتەکانی، پاڵنەرێکی (شەڕانگێزی ، عدواني) کە پاڵی پێوە دەنێ تاوان ئەنجام بدات، وە پاڵنەرێکی (ئەخلاقی) کە هانی دەدات بۆ کاری چاکە ...

جا ئەم دوو پاڵنەرە بەردەوام لە ململانێ دان، وە ئەگەر هاتوو پاڵنەری شەڕانگێزی توندتر و بەهێزتر بوو، ئەوا لەم مرۆڤە دەکات کە کاری خراپ و تاوان ئەنجام بدات، وەکاتێ تاوانەکەی ئەنجام دا هەست بە (گوناهـ) دەکات، و ئەم هەستە ئازاری دەدات، تاوای لێ دێ هەوڵی خۆکوشتن بدات، یان خۆی بدات بە دەست پۆلیس و دان بەتاوانەکەی دا بنێ، یان ئەم هەستە وای لێدەکات بگەڕێتەوە بۆ شوێنی ڕوودانی تاوانەکەی و وە ئەم گەڕانەوەیەی بە جۆرە سزایەك دادەنێ بۆخۆی، چونکە نزیك دەبێتەوە لەو شوێنەی کە ئازاری پێ دەگەیەنێ چونگە ئەگەری دەستگیردنی نزیك دەبێتەوە لەو شوێنە چونکە جیاوازی پۆلیس و لێکۆڵەر لەم شوێنەدا هەن.

کاتێ کە تاوانبار ئامادەی شوێنی ڕووداوی تاوانەکەی دەبێ، وا تێبینی دەکرێ کە هەندێ هەلس و کەوتی دەکات بێ ئەوەی هەست پێ بکات(لاشعوری) وەکو هەندێ شێواندنی دەروونی، هوڕێنەکردن (فلتات اللسان) وەهەندێ جموجوڵی جستەیی ... هتد .

جا لێرە لێکۆڵەر بەهۆی بەهێزی تێبینی کردنی دەتوانرێ ئەم هەڵسوکەوتە دەستنیشان بکات و سوودی لێ وەرگرێ بۆ ئاشکرا کردنی تاوانەکە.




## ناسینەوە بەهۆی سەگەر پۆلیسی یەکان

## (الاستعراف بواسطة الكلاب البوليسية)

ئەوەی سەگی پۆلیسی لە ئاژەڵەکانی تر جیادەکاتەوە ، ئەوەیە کە هەستی بۆن کردنی زۆر بەهێزە، بەرادەیەك بەکارهێنانی ئەم هەستە لەلای سەگی پۆلیسی گەیشتۆتە ڕێژەی 100٪ .

کاتێ سەگی پۆلیسی دەهێنرێت بۆ شوێنی تاوانەکە، ئەوا بەدووای بۆنی تاوانبار دەگەڕێت کە لەهەوا( هواء ) بڵاو بۆتەوە، یان بەسەر ئەوشتانەی کە دەستی لێ داوە، یان ئەو شوێن پێ یەیی کە جێی هێشتووە لەسەر زەوی، ئینجا دەگەڕێت بەدوای خاوەنی ئەم بۆنە .

چونکە هەروەك دەزانین، هەر مرۆڤێك خاوەن بۆنی تایبەتی بەخۆیەتی لە بۆنی جەستەیی تر جیاوازە، وە ئەم بۆنە بەجل و بەرگی دەنووسێت، یان هەر کەرەسەتەیەك لە دەستی لێ بدات و ئەم بۆنە لەهەوادا بڵاو دەبێتەوە.

جێی ئاماژە بۆکردنە، هەستی بۆن کردن لەلای سەگ کاریگەری یان دوو ڕۆژ یان کەمێك زیاتر بمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو کەرستەو ئامێرەکان کە بۆنی جەستەی تاوانباری لەسەرە لە شوێنێکی داخراوو پارێزگاری لێ کرا ، ئەوا بۆماوەی جەند هەفتەیەك یان چەند مانگێك دەخایەنێ.

### مهام الكلاب البوليسيه

### سەگی پۆلیسی بۆچی بەکاردێت ؟

بۆ ئەم مەبەستانەی خوارەوە :-

1- بەدەورگەڕان بە دووای ئەوتاوانبارەی کە تاوانی ئە نجام داوە، بەتایبەتی بۆنی کوشتن و دزین و (تهريب)

2- گەڕان بەدوای ماڵە دزراوەکان و زانینی شوێنی شاردنەوە و حەشاردانی

3- ناسینەوە (الاستعراف)

4- پاسەوانی کردن لەکەسەکان و خانووەکان و دامەزراوەکان.

**بۆنمونە :** بۆ دەستنیشان کردنی تاوانبار، ئەو شتەی یا ئەو کەرستەی کە تاوانبار جێ هێشتووە لە ر شوێنی ڕوودانی تاوان، دەهێنرێت و دەخرێتە بەردەم سەگەکە بۆئەوەی بۆنی بکات، یاخود سەگەکە دەهێنرێت بۆ شوێنی ڕوودانی تاوانەکە بۆئەوەی بۆنی ئاسەواری جێ هێڵراوەکان بکات کە تاوانبار جێی هێشتووە، پاشان







ئەو کەسەی کە تۆمەتبارە لەگەڵ ( 8 ) کەسی تر دادەنرێت بە شێوەی سرە( صف ) واتا یەك لە پشتی ئەویتر دانیشت و ماوەی نێوانیان یەك هەنگاو(خطوة) بێ، ئینجا سەگەکە لەم نێوانە تێ دەپەڕێت تا بۆنی تۆمەتبار بکات ، ئەم تاقیکردنەوەش بۆ ناسینەوەی تۆمەتبارە (الاستعراف)

## واجبات المحقق في استخدام الكلاب البوليسي

### ئەرکەکانی لێکۆڵەر لەکاتی بەکارهێنانی سەگی پۆلیسی

(1) هەڵگرتن و پارێزگاری کردن لە شتەکان(الاشياء) بۆئەوەی پیشانی سەگی پۆلیسی بدات بۆ بۆن کردن.

(2) هاوکاری کردن لەگەڵ ڕاهێنەری سەگەکە (مدرب الكلب) تاوەکو ئاگاداری بکاتەوە لەبارودۆخی ڕووداوەکە، تاوەکو ئەم ڕاهێنەرە پلانێکی گونجاو دیاری بکات.

(3) دەبێ شتەکان بە جودا هەڵگیرێت و تێکەڵی یەکتر نەکرێت، واتا دوو(مادة) یان کەرستە بەیەکەوە هەڵنەگرین، چونکە ئەمە کاری سەگەکە تێك دەدات، ڕەنگە بۆنەکەیان جیا بێ، یاخود ڕەنگەئەم دوو کەرستەیە هی یەك کەس نەبێ، بەڵکو هی دوو کەسی جیاواز بێ.

(4) دواخستنی کاری شارەزایانی، وەکو شارەزایانی پەنجەی دەست یان شوێن پێ، تاوەکو شوێنی تاوان یان کەرەستەی جێماو بۆنەکرێت لەلایەن سەگی پۆلیسی ئەوەش بۆئەوەیە، تا بۆنی ئەم شارەزایانە تێکەڵ نەبێ بە بۆنی تاوانبار.

(5) پاریزگاری کردن لەشتەکان و داپۆشینیان تاوەکو سەگی پۆلیسی ئامادە دەبێ.

(6) ئامادەکردنی (محضر) سەبارەت بەم پرۆسەیە ، واتا پرۆسەی ناسینەوەو گەڕان بەدوای تاوانبار بە بەکارهێنانی سەگی پۆلیسی، ئینجا واژووی لەسەر بکرێت لەلایەن لێکۆڵیوەر و ڕاهێنەری سەگی پۆلیسی و دووشاهێد.




# کردنەوەی گۆڕ و نۆڕینی لاشەی مردوو

## فتح القبر والكشف على الجثة

.............................................................................

.............................................................................

.............................................................................

زیاتر بێ یان بەیەکێ لەم دوو سزایە بڕوانە (ماددەی 371) لەیاسای سزادانی عێراق) هەروەها ماددەی (374) لە یاسای سزادانی عێراق سزای زیندانی کردن و غەرامەت کردنی دیاریکردووە، وەك ئەوەی لە ماددەی (373) هاتووە، هەرکەسێك بە شێوەیەکی بەئەنقەست(عمدي) حورمەتی لاشەیەك تێك بدات، بەلام ئەگەر هاتوو ئەم شکاندنی حورمەتەی لاشەی مرۆڤ بە مەبەستی تۆڵەسەندنەوە یان بەمەبەستی ئابڕوو بردن(تشهير) بوو، ئەوا ماوەی زیندانیەکە بۆ ئەوکەسەی ئەم کارە کردووە بەرز دەبێتەوە بۆ سێ ساڵ.

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا، یاسا هەندێ جار و بەچەند مەرجێکی دیاریکراو ڕێگا دەدات کە گۆڕ بکرێتەوە و کەشفی لاشە بکرێت، چونکە هەندێ جار وارووەدات کە کەسێك بمرێت و خزم و کەسی دەیشارنەوە، ئینجا لەکاتی لێکۆڵینەوە دەردەکەوێ کە ئەم مردنە سروشتی نیە بەڵکو تاوانکاریە، و ئەم کەسە بە ژەهر مردووە، جالێرەدا پێویست دەکات ئەم لاشەیە دەبهێنرێت بۆ زانینی هۆی مردنەکە لە ڕێگای ڕەوانەکردن و مخصص کردن (تشريح) گرنگە.

جا لەبەر ئەم حاڵەتانە، ماددەی (71) لەیاسای (اصول المحاكمات الجزائية) ڕێگای داوە بە کردنەوەی گۆڕ بەمەبەستی کەشف کردنی لاشە بەلام بەم مەرجانەی خوارەوە :

1-دەبێ مۆڵەت (إژن) لە دادوەری لێکۆڵینەوە وەربگیرێت، واتا نە لێکۆلێوەر و نە داواکاری گشتی و نە پزیشکی شەرعی بۆیان نیە گۆڕ بکەنەوە بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندی لە دادوەری لێکۆڵینەوە.

2- دەبێ کردنەوەی گۆڕ و کەشفکردنی لاشەی مردوو لەڕێگای شارەزایان پزیشکی تایبەت بێ، واتا نە لێکۆڵەر و نە خوودی دادوەری لێکۆڵینەوە بۆیان نییە ئەم کارە بکەن بەخۆیان.




## فتح القبر والكشف على الجثة

یاسای سزادانی عێراقی سزای داناوە لە مادەی 373 بە حەبس بۆ ماوەی دووساڵ زیاتر نەبێت وە غەرامەش لە 200 دینار زیاتر نەبێت بۆ هەرکەسێ کە دەستکاری حورمەتی قەبر بکات یان بیڕوخێنێت یان تێکی بدات، مادەی 374سزای داناوە لەهەمان یاسا بە حابس بۆماوەی دووساڵ زیاتر هەروەها غەرامەش 200 دینار زیاتر نەبێ هەرکەس دەستکاری حورمەتی قەبرێك بکات یان بەشێك لە تەرمەکە ئەگەر کارەکە بەمەستی تۆڵەسەندنەوە بێت ئەوا سزاکەی لە 3 ساڵ زیاتر نابێت، ئامانج لەم دەقە سزایە دڵنیابونە لەسەلامەتی و دروستی حورمەتی قەبر و تەرم، لەگەڵ ئەوەش هەندێك جار وا پێویست ئەکات بەکردنەوەی قەبر و پشکنینی تەرم لەپێناو گەیشتن بەڕاستەقینە، لەبەر ئەوە میثاقي عێراقی ڕێگەی داوە لەمادەی 71 لەیاسای اصول محاکمات جزائیە بۆ حاکم تحقیق ڕێگەی داوە بەکردنەوەی قەبر و ئەگەر پێویست بوو بۆ پشکنین تەرمەکە لەڕێگەی خەبیرو دکتۆری تایبەت بەو کارە، وەبەهاتنی ئەو کەسانەی کە توانای ئامادەبونیان هە لەگەڵ ئەوکەسانەش کە پەیوەندیان بە هۆکاری مردنەکە هەیە.

**س/ مەرج بەپێی ماددەی (71) بۆ ئەوەی بتوانین قەبرێک بکەینەوە پێویستە ئەم مەرجانە هەبێت**

**(1) أن یؤخذ اذن الحاکم التحقیق .**

نە محقق نە مدعی گشتی نە دکتۆری تایبەت ناتوانن قەبر کاتەوە تەنها لەڕێگەی ئیزنی حاکم تحقیق نەبێت لەهەمان کاتدا محکمەی موضوع ئەتوانێ فەرمانی کردنەوەی قەبر دەربکات بۆ پشکنینی تەرمەکە بەو اعتبارەی کردنەوەی قەبر یەکێکە لە اجرائاتی تحقیق .

(2) ئەبێت کردنەوەی قەبر بۆئەوە بێت پشکنینی تەرمی مردوەکە لەڕێگەی خەبیرێکەوە بێت یان دکتۆرێکی شرعی بۆ محقق و حاکم تحقیق نیە هەڵسێ بە کردنەوەی قەبر بۆ سەیرکردنی تەرمی مردوەکە.

(3) پێویستە هۆکارێك هەبێت بۆکردنەوەی قەبرەکە واتە لەڕێگەی ئەم ئیجرائاتەوە بگەینە ڕاستەقینەیەك.








(4) وا باشتره خزمەکانی مردوەکە ئامادەبن بەلام بەپێچەوانەوە هیچ کێشەنیە، بەلام نەبێ پیان بووترێ بۆئەوەی ئامادەبن، هەروەها پێویستە ئەو کەسانەی کە پەیوەندیان بەبابەتەکەوەهەیە ئامادەبن، لەگەڵ ئەوەش ئیجرائات هەر بەردەوام ئەبێت.

ئەوەی تێبینی کراوە حاڵەتەکانی کردنەوە قەبر ئەگەڕێتەوە بۆ شاردنەوەی هۆکاری مردنەکەی یان هەڵەی هونەری کە دکتۆرێکی شەرعی ئەیکاتەوە کە حکم تحقیق بۆی دەرئەکەوێ یان محکمەی موضوع.

**س / هۆکاری کردنەوەی قەبر پێویستە علاقەی لەسەر ئەم أجراءات تایبەت بە تحقیق ئەمانەن ؟**

1- دڵنیا بوون لەوەی کە قەبرەکە هی ئەو تەرمەیە ئەمیش لەڕێگەی خزمەکانی تەرمەکە یان دوو شاهێد .

2- دکتۆر یان خەبیر فەرمان دەرئەکات بەناردنی تەرمەکە بۆ (معهد الطبي العدلي) بۆ تشریع کردن کە زۆر جار دکتۆر پشکنینی تایبەت خۆی لەسەر تەمەکە ئەکات.

3- دووبارە ناشتنەوەی تەرمەکە لەدوای پشکنین و تشریع طبي

4- محضەرێکی تایبەت بەو کارە ڕێك ئەخەن.

## أصول تحقيق الاجراءات

بەو شێوە و بەودەستەواژەی خۆی، وەنابێ قەسەکانی بچوێندرێن لەکاتی شایەدی دانی بەهیچ شێوەیەك، مەگەر باسی هەندێ شتی لابەلا و پەیوەندی نەبوو بەڕوودانی کێشەکە نەبێ، یاخود ئەگەر باسی هەندێ شت بکات کە کار لەکەسانی تر بکات یان قسەکانی ئابڕووبەربن یان ئاسایش بشێوێنێ.

هەروەها نابێ هیچ کەس پرسیاری ئاراستەی شاهێد بکات بەبێ ڕەزامەندی لێکۆڵەر هەروەها نابێ پرسیاری دەرەکی ئاراستە بکرێ کە پەیوەندی نەبێ بەکێشەکە، هەروەها نابێ هیچ قسەیەك یان هێمایەك ئاراستەی شاهێدەکە بکرێت، ئەگەر هاتوو مانایەك بگەیەنی کە ببێتە هۆی ترساندنی یان شێوازی هۆش و بیری .

ئینجا پاش کۆتایی هاتنی نوسینەوەی قسەکانی شاهێدەکە، کە دەبێ لەهەر سڕینەوە و زیادەکردن و گۆڕانکاری (الشطب والإضافة والتعديل) ئینجا شاهێدەکە واژووی لەسەر دەکات پاش خوێندنەوەی، یان





بۆی دەخوێندرێتەوە ئەگەر نەخوێندەوار بوو، ئینجا لەلایەن لێکۆڵەرە یان ئەوکەسەی کە نوسیویەتەوە واژوو دەکرێت، لەکاتی بوونی سڕینەوەی(الشطب ) یان ڕاست کردنەوە (تصحیح) ئەوا کار بەم گۆڕانکارییە ناگرێ وەگەر دادوەر یان لێکۆڵەر لەگەڵ شاهێدەکە واژووی لەسەر نەکەن.

پاش ئەمە ، تۆمەتبار یان لایەنەکانی تر(الخصوم) دەتوانن تێبینی خۆیان بڵێن سەبارەت بەم شایەدییە ئەمەش پاش وەرگرتنی ڕەزامەندی دادوەری لێکۆڵینەوە یان لێکۆڵێوەر.

**پێناسەی ( الجهاز كشف الكذب) :-** ئامێرێکە هەڵدەستێ بە تۆمارکردنی گۆڕانکاری میترۆلۆجی لەلاشەی مرۆڤ کە لەکاتی لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەم مرۆڤە ئەم گۆڕانکاریانە سەر هەڵدەدەن.

- **بەربەستەکانی شاهێدی دان (موانع الشهادة) :-** لەبنەڕەتدا ، هەرکەسێك کە شایستەی شایەدی واتە ، بۆی هەیە شادی بدات، بەبێ جیاوازی لەسەر بنەمای ڕەگەز یان پایەیی کۆمەڵایەتی یان ئابووری یا سیاسی بەڵام هەندێ جار، لەبەرچەند هۆیەك یاسا هەندێ کەس بەردەرکردووە لە شایەدی دان لەهەندێ حاڵەت کە ئەوانیش ئەمانەن :

**1- شایەدی هاوسەرەکەی دژی یەکتر :-**

بڕگەی (أ) لەماددەی (68)ی یاسای (أ ، م ، ج) ڕێگەی نەداوە کەیەکێ لەهاوسەرەکان ببێتە شاهێدی دژی ئەوی تر، تەنها لەو حاڵەتانە نەبێ کە یەکێ لەم هاوسەرانە تۆمەتبار بوو بەئەنجامدانی تاوانی(الزنا) یان بەتاوانێك دژی ئەم هاوسەرە یان ماڵەکەی یان دژی منداڵێکی ئەم هاوسەرە.

هۆی ئەم ڕێگە نەدانە دەگەڕێتەوە بۆ هێشتنەوەی پەیوەندی هاوسەرێتی و بەردەوام بوونی.

جێی ئاماژەیە، ئەم ڕێگەنەدانە بە شایەدی دان دژی هاوسەر، کاری پێ دەکرێت تەنانەت ئەگەر هاتوو ئەم پەیوەندییە هاوسەریە کۆتایی پێ هات بەهۆی (الطلاق)، ئەگەر هاتوو شایەدی دانەکە پەیوەندی هەبوو بەکێشەیەك کە لەکاتی هەبوونی پەیوەندی هاوسەرێتی ڕوویدابوو.

**2- شایەدی باوان و نەوەکان دژ بەیەکتر :-**

**(شهادة الأصول والفروع بعضهم ضد بعض):-** بڕگەی (ب) لە ماددەی (68) ی یاسای ( أ ، م ،ج) ڕێگای نەداوە یەکێ لەباوانەکان ببێتە شاهێد دژی یەکێ لەنەوەکانی، هەروەها ڕێگای نەداوە یەکێ لەنەوەکان ببێتە شاهید دژی یەکێ لە باوانەکان.








هۆی ئەم ڕێگە نەدانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەیاسا نایەوێ پەیوەندییە خێزانییەکان (العلاقات العائلية) بخاتە مەترسییەوە.

جێی ئاماژە بۆکردنە، ئەم ڕێگە نەدانە لەم دووحاڵەتەی کە باسمان کرد تەنها تایبەتە بە شایەدی دان(الاثبات)، چونکە بڕگەی(ج) لەماددەی (68)ی یاسای (أ ، م ،ج) ڕێگای داوە کە یەکێ لە وانەی باسمان کردن، ببێتە شایەدی بەرگری (شاهيد الدفاع) بۆئەوی تر.

هەمان بڕگە داکۆکی لەسەر ئەوە دەکات، هەربەشێك (جزء) لەم شایەدی دانە ئەگەر هاتوو لەبەرژەوەندی ئەم کەسە نەبوو کە شایەدیەکەی بۆ ئەو دەدرێت، ئەوا ئەم بەشە پشت گوێ دەخرێت.

**بۆنموونە** : کاتێ ژنێك شایەدی بەرگری دەبێ بۆ مێردەکەی، جا لەوکاتەی کەشایەدیەکەی دەدات، هەندێ ڕستە یان ووشەی سادە دەکات کە تۆمەتەکە دەخاتە سەر مێردەکەی، لێرەدا دەبێ ئەم بەشە (ئەم ڕستەیە یان ئەم ووشە)یە لە کاربخرێت و پشت گوێ بخرێت.

## گفتو گۆکردن لەگەڵ شایەدەکان

## مناقشة الشهود

پاش ئەوەی لێکۆڵێوەر شایەدی شاهێدەکە دەنووسێتەوە، دەکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵی، پرسیاری ئاڕاستە دەکات سەبارەت بە هەندێ بابەت کە ڕوون نییە لەشایەدی یەکەی، یان شایەدیەکەی هەندێ کەم و کوڕی تێدایە، یان جۆرێك (تناقض) هەیە لەقسەکانی، یان لەگەڵ قسەکانی شاهێدەکی تر ناگونجێت، یان شایەدیەکەی پێچەوانەی واقیعە ... هتد.

جا لەسەر لێکۆڵێوەر پێویستە لەکاتی گفتوگۆکردن لەگەڵ شایەدەکان ڕەچاوی ئەم ڕێسایانە بکات: -

1- **ڕیزبەندی لە ئاڕاستە کردنی پرسیارەکان (الترتيب في توجيه الأسئلة)** :- واتا دەبێت ئەو پرسیارانەی کە لێکۆڵەر ئاڕاستەی شاهێدی دەکات پەیوەندی هەبێ بە تاوانەکە( ڕووداوەکە) بە شێوەیەکی ڕیزبەندی، جا ئەوکاتەی کە پرسیار دەکات لە بابەتێك لەبابەتەکانی تاوان، دەبێ گشت پرسیارەکانی تایبەت بەم بابەتە لەشاهێد بکات ئینجا بچێتە سەر بابەتێکی تر یان خاڵێکی تر. بۆنمونە :- کاتێ لێکۆڵەر پرسیار لەشاهێد دەکات سەبارەت بە (کاتی ڕوودانی تاوان) جا دەبێ هەر پرسیارێك کە تایبەت بوو بەکاتی ڕوودانی تاوان لە شاهێد بکات ئینجا بچێتە سەر پرسیارێکی تر.

2- بەکار هێنانی شێوازی(منطقي) لە ئاڕاستە کردنی پرسیارەکان :-

واباشترە بۆ لێکۆڵەر، کاتێ دەیەوێ پرسیار ئاڕاستەی شاهێد بکات، ئەم پرسیارە ڕاستەو خۆ نەکات، بەڵکو هەندێ پێشەکی(تمهید) بداتێ ئینجا ئەو پرسیارەی لێ بکات.

بۆنمونە : کاتێ لێکۆڵەر دەیەوێ ئەم پرسیارە بکات : ئایا تۆمەتبار لە نووسینگەی (ئازادی) بینی ؟

لێرەدا دەبێ پێش ئەوەی ئەم پرسیارەی لێ بکات ئەم پرسیارانەی ئاڕاستە بکات :-

- **ئایا پێشتر چووی بۆ نوسینگەی ئازادی ؟**
- **ئایا لە (فلانە) ڕۆژ لە نووسینگەی ئازادی ئامادەبووی ؟**
- **هۆی ئامادە بوونت لەم نوسینکە چی بوو ؟**

جا ئەگەر هاتوو وەڵامی شاهێد سەبارەت بەم پرسیارانەی سەرەوە بە (بەڵێ) بوو، لێرەدا لێکۆڵێوەر پرسیارەکەی خۆی ئاڕاستە دەکات کە [illegible] لە : ئایا تۆمەتبار [illegible] نووسینگەی(ئازادی) بینی ؟

وەئەگەر هاتوو لێکۆڵێوەر تێبینی کرد [illegible] تناقض) هەیە [illegible]کانی شاهێد، یان ناگونجێ لەگەڵ واقیع و ڕاستی دا، یان مەعقول نییە، لێرەدا دەبێ ئەمەی بۆ ڕوون بکاتەوە کە قسەکانی لەڕاستی و واقیع دوورن، بێ ئەوەی پەنا ببات بۆ هەڕەشە لێ کردنی یان ترساندنی یان [illegible] دانی (التعذیب) یان هەرشتێك کە دەبێتە هۆی شلەژانی بیری ئەم [illegible]هێدە .. بەڵکو بەپێچەوانەوە، دەبێ بەشێوەیەکی هێمن و لەسەر خۆ داوای لێ بکات کە قسە[illegible] بکات و ئامۆژگاری بکات کە درۆکردن لە شایەدی دان کارێکی باش نییە و تووش[illegible] یاسایی دەکات.

3- سادەیی پرسیارەکان و ڕوون بونیان : (بساطة الاسئلة ووضوحها) :-

واتا دەبێ ئەو پرسیارەی ئاڕاستەی شاهێد دەکرێ، ئەو شتەی کەداوای لێ دەکرێ بە ڕوونی و ئاشکرایی دیاری بکرێ، و دوور بێ لە هەر نادیارییەك(غموض) بۆ ئەوەی شاهێدەکە بە ئاسانی لێی تێ بگات.

وەئەگەر پێویست کرا ئەوا دەبێ لێکۆڵێوەر بۆی ڕوون بکاتەوە و تێی بگەیەنێ، چونکە زور لەشاهێدەکان بەپەلە وەڵامی پرسیارەکان دەدەنەوە کە ئاڕاستەیان کراوە بێ ئەوەی لەم پرسیارانە تێ بگەن.

4- نابێ پرسیارەکان وەڵام دەربن (التلقین) :- (أن یکون أسئلة خالیة من التلقین) :- بوو

واتا نابێ لێکۆڵەر پرسیارێك ئاڕاستەی شاهید بکات بکە وەڵامدەربێ، واتا جۆرە وەڵام دانەوەیەکی تێ دابێ ، بۆنمونە نابێ پرسیارەکە وابێ : تۆ تۆمەتبارت بنینیوە لە نووسینگەی(فلانی) وانییە ؟

یاخود لێی دەپرسێ : ڕەنگی ئەو کڵاوەی کەلەسەر تۆمەتبار چ ڕەنگ بوو ؟

لەجیاتی ئەوەی بڵێ : تۆمەت بار چی لەسەر بوو ؟

## گەڕان بەدوای ڕاستی شایەدی

## (تحري صدق الشهادة)

کاری لێکۆڵەر تەنها گوێ گرتن نیە لە قسەکانی شاهێد ، بەڵکو دەبێ لە ڕاستی ئەم شادیەش بگەڕێت تاوەکو بزانێت ڕاستە یان ڕاست نییە، جا ئەگەر دەرکەوت بۆی کە ڕاستە ئەوا وەکو بەلگەیەك کاری پێ دەکات، وەئەگەر وانەبوو ئەوا پشتی پێ نابەستێ.

جا ئەو ڕێگایانەی کە بەهۆیانەوە لێکۆڵیوەر بتوانێ لە ڕاستی شایەدی بگات زۆرە و بەپێی بارودۆخی ڕووداوەکە دەگۆڕدرێت، وا لەخوارەوە باس لە هەندێکیان دەکەین :

1- **پەنا بردنە بۆ عەقل (تحيكم العقل)** :- لەسەر لێکۆڵەر پێویستە عەقڵ بکاتە پێوەر بۆ شێوازی ئەو ڕووداوانەی کە شاهید باسی دەکات، وە ئایا بەپێی عەقڵ دەکرێ ئەم شتە وابێ یان وای ڕووی دابێ، بۆنمونە : کاتێ شاهێد دەڵێ کە ئەو تۆمەتباری بینیوە کە بەچەقۆ لەم کەسی کوژراوەی داوە، کە لەڕاستی ئەم کەسە بەخنکاوی دۆزراوەتەوە.

2- **پەنابردن بۆ(عرف) (تحكيم العرف)** :- پێویستە لەسەر لیکۆڵیوەر قسەکانی شاهێد دووربخاتەوە ئەگەر هاتوو لەگەڵ عورف و نەریتی خەڵك پێچەوانە بوو، وەئەگەر هاتوو هۆیەکی دروست هەبوو کە بیسەلمێنێ کە لە نەریتی خەلکی دەرچووە چونکە زۆر بە دەگمەن وا ڕوودەدات کە خەڵك لە عورف و نەریتی چەند ساڵە لابدەن، مەگەر هۆیەکی بەهێز هەبوو بۆ ئەم لادانە .

3- **خوێندنەوە کەسایەتی شاهێد لە ڕووی کردار و توانای عەقڵی :**

**(دراسة شخصية الشاهد من حيث سلوكه و قوة العقلية)** :- هەندێ شاهێد لەکاتی شایەدی دان باس لە هەندێ زانیاری دەکەن، یان لە شێوەی وەڵامدانەوەیان دیارە کەڕاست ناکەن لە شایەدی دانەکە، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو لە پایەکی کۆمەلایەتی وا دابن کە ڕێگایان پێ نادات ئەم زانیاریانە بزانن.

بۆنمونە : کەسێکی دانیشتوی لادێ کە توانای خوێندنەوە و نووسینی نییە شایەدی دەدات کە ئەو تۆمەتباری بینیوە لەماڵی کەسە کوژراوەکە هاتۆتە دەرەوە و سواری ئۆتۆمبێلێکی تایبەت بووە لە جۆری (مارسیدس) مۆدێل (2005) و ژمارەی سەر ئۆتۆمبێلەکە (12265) بووە ؟ !!!




جالێره دەردەکەوێ کە ئەم قسانەی پێ گوتراوە، چونکە ڕۆشنبیری ئەم شاهێدە ڕێگای پێ نادات کە ئەم زانیاریانە بزانێت.

## 4- تاقیکردنەوەی هەستەکانی شاهێد (اختبار حواس الشاهید) :-

لەسەر لێکۆڵێوەر پێویستە هەستەکانی شاهێد تاقی بکاتەوە ئەگەر گومانی هەبوو لەیەکێ لەم هەستانە ، بۆنمونە : شاهێدێك ئاستی بینینی لاوازە، شایەدی دەدات کە ئەو تۆمەتباری بینیوە لە مەودای (100م) و دەتوانێ بیناسێتەوە.

یاخود شایەدی دەدات کە ئەو گوێی لە (دەنگە دەنگ (همس) بووە کە لەو ژوورەی تەنیشت ژوورەکەی ئەو دەرچوو، لەگەڵ ئەوەی کە ئاستی بیستنی زۆر لاوازە یاخود کزە.

وە ئەگەر پێویست کرا لەحاڵەتی زەرورەت، لەسەر لێکۆڵێوەر پێویستە بەخۆی تاقیکردنەوە ئەنجام بدات، واتا بچێتە ئەو شوێنەی کە شاهێدەکە باسی دەکات، بەڵام دەبێ ڕەچاوی بارو دۆخی شوێنەکە بکات کە دەبێ هەمان بارودۆخ بێ کە شاهێدەکە ڕووداوەکەی تیادا بینیوە، لەڕووی شوێن و کات و کەش و هەوا، وە نابێ تاقیکردنەوەکە بەڕۆژ ئەنجام بدات ئەگەر هاتوو شاهێدەکە بابەتی شایەدیەکەی بەشەو بینی بێ.

## 5- لێکچوونی شـایەدی (تطابق الشهادة) :- 

واتا هەندێ جار شایەدی شایەدەکان بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش لەیەك دەچێ لە ڕووی وشەو ڕستە و ڕیزبەندی، کە ئەمەش وادەکات جێی گومان بێ ، وڕەنگە جۆرە کۆك بونێك( اتفاق) هەبێ لەنێوانیاندا، و ڕەنگە بە شێوەیە ئاڕاستە کراووبن، چونکە ناکرێ و قەبووڵ نیە چەند شاهیدێك هەمان دەستەواژە و ڕستە و هێما بەکاربێنن، لەکاتی شایەتی دان، مەگەر پێیان گوترابێت و ڕاهێنانی لەسەر کرابێ.

## 6- پرسیار کردن لە وورده کاریەکان (السؤال على الجزئيات والتفاصيل) :- 

زۆر جار پرسیار کردن زۆر لە ووردەکاری لەشاهێد، ڕاستی و دروستی شاهێد دەردەخات، یان بە پێچەوانەوە درۆی شاهێد بە دیار دەکات، چونکە ئەگەر شاهێد نەی توانی وەڵامی ئەم ووردەکاریانە بداتەوە، یان شلەژان یان دوودڵ بوو لەوەڵام دانەوە، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە درۆی کردووە لەشایەدیەکە ئەم ڕێگایە زۆر سوومەندە بۆ ئاشکراکردنی ئەو کەسانەی کە بەدرۆ شایەدی دەدەن، یان بەکرێ گیراون بۆ




دانی شایەدی (زور) چونکە ئەم جۆرە شاهیدیە ڕادەهێنرێت لەسەر چەند شتێك پێش ئەوەی شایەدیەکە بدەن، لەگەڵ ئەوەشدا ووردەکاری ئەم ڕووداوەش نازانن .

7- **بەکارهێنانی هەندێ فێڵــی مەشــروع (أستعمال الحيل المشروعة)**:- لێکۆڵێوەر دەتوانێ هەندێ فێڵی ڕەوا و مەشروع بەکاربێنێ بۆئەوەی لە ڕاستی و دروستی شایەدیەکە بگات، بۆنمونە : گۆڕینەوەی تۆمەتبار بە کەسێکی تر ، ئینجا پرسیار لەو شاهێدە بکات کە ئایا ئەم کەسە تۆمەتبارەیە کە بینیویەتی، یان : چەند کەسێك پیشان شاهێد دەدات کە هیچیان تۆمەتبارنین و داوای لێ دەکەن کە بکات و تۆمەتباری بۆ دیاری بکات لەنێوانیان.

8- **دووبارە کردنەوەی شــاهێدی (تکرار الشهادة)** :- ئەگەر لێکۆڵێوەر تێبینی کرد کە شاهێد لەکاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکە دەشلەژێ و نارەحەت دەبێ، ئەوەبۆی هەیە داوای لێ بکات دووبارە شایەدیەکەی باس بکاتەوە، جا ئەگەر دووبارکردنەوەکە جیاوازییەکی ئەو تۆی نەبوو لەگەڵ جاری پێشوو، ئەوا ڕاست دەکات، بەلاّم ئەگەر وانەبوو ئەوا ڕاست ناکات.

9- **ئامۆژگاری کردنی شاهێد و هاندانی بۆ ڕاستی** :- واباشە لێکۆڵێوەر ئامۆژگاری شاهێد بکات و هانی بدات لەسەر شاهێدی دان بەڕاستی و دووركەوتنەوە لەدرۆ، لەگەڵ لەبەر چاوگرتنی کەسایەتی و ڕۆشنبیری ئەم شاهێدە لەکاتی ئامۆژگاری کردنی.

## درۆ کردن لەشایەدی دان
## (الكذب في الشهادة)

ئەو حاڵەتەی کە شاهێد ڕاست ناکات لە شایەدی دانەکەی دوو حاڵەتە :

1- یان ئەوەتا ڕاستیەکان دەزانێ بەلاّم بە ئەنقەست ( عمدی) هەوڵ دەدات ئەم ڕاستیانە بگۆڕێت، ئەم حاڵەتە پێی ئەگوترێت (درۆکردن) (الكذب).

2- یان ئەوەتا ڕاست ناکات لەقسەکانی بەبێ (قصد) و دەزانێ ئەو قسانە کە دەیکات ڕاستن، ئەم حاڵەتە پێی دەگوترێت(هەڵە کردن) (الخطأ).

لەڕاستی دا، گرنگترین شت کە دێنە بەردەم لێکۆڵێوەر ئەوەیە کە چۆن جیاوازی بکات لەنێوان شاهێدێك کە زانیاری نادروست (درۆ) دەدات و بەئەنقەست ڕاستیە سەرەکیەکان دەشارێتەوە، لەگەڵ شاهێدێك کە




زانیاری دروست دەدات بەلآم سەرچاوەی ئەم زانیاریە(هەڵە)یە بەبێ ئەوەی بزانێت کە ئەم شایەدیە هەڵەیە .

جا بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەم کێشەیە، پێویستە لەسەر لێکۆڵێوەر لەکاتی گۆ گرتن لەقسەی شاهێدەکان، زۆر وریا و چاو کراوە دەبێ، ئاگاداری هەرشتێك یان هەڵچونێك بێ کەلەم شاهێدانە دەردەچێ، هەروەها دەبێ لێکۆڵێوەر شارەزایەکی تەواوی هەبێت، لەسەر ڕووداوەکە لەهەموو لایەنێکەوە، بۆ ئەوەی لەکاتی گفتوگۆکردنی لەگەڵ شاهێدەکان بگاتە خاڵە لاوازەکان یان ئەو خاڵانەی کە گومانی لێ هەیە، یان ئەو خاڵانەی کە(درۆ)ن ، و ڕاست نین.

هەروەها تێبینی دەکرێ کە ئەو شاهێدەی کە درۆ دەکات زۆر گرنگی بە باسکردنی شتە لاوەکیەکان دەدات و هەوڵ دەدات باس لەشتە گرینگەکان نەکات یان خۆی دەدزێتەوە لەباس کردنیان.

جا ئەگەر لێکۆڵێوەر گومانی هەبوو لەقسەکانی شاهێدێك، پێویستە لەسەری ئەم هەستەی دەر نەبڕێ یەکسەر، بەڵکو لەدڵی خۆی بیشارێتەوە، و ڕێگای پێ بدات یان قسەکانی بە ئازادی تەواو دەکات، وە لەلای خۆی ئەو شتانە تۆمار بکات کە هاودژن (متناقض)ن یان پێچەوانەی واقیعن، جا ئەگەر هاتوو ئەم شاهێدە بەردەوام بوو بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر درۆیەکانی، زۆر زەحمەت بتوانێ گشت ئەم قسانە ڕاست بکاتەوە، جاوا باشترە لێکۆڵێوەر وا بەدیار بخات کە ئەو باوەڕ بەم قسانە دەکات و تێبینیەکان لەلای خۆی تۆمار بکات، چونکە ئەگەر دەرکەوت بۆ ئەم شاهێدە کە لێکۆڵێوەر باوەڕی پێ ناکات هەوڵ دەدات قسەکانی ڕێك بخات لەبابەتی ڕووداوەکە.




## هۆیەکانی درۆ کردن لە شایەتی دان

## (أسباب الكذب في الشهادة)

درۆ کردن لە شایەتی دان دووجۆری هەیە :-

**یەکەم** :- هەندێ هۆ هەیە پەیوەندی بە خودی شاهێدەکە هەیە یان پەیوەندی شاهێدەکە لەگەڵ لایەنەکانی کێشەکە، ئەم هۆیانەش پێ یان دەگوترێت (هۆیە کەسیەکان) واتا (الاسباب الشخصية)

**دووەم** :- هەندێ هۆ هەیە پەیوەندیان بەبابەتی تاوانەکە (موضع الجريمة) و پەیوەندی شاهێدەکە بەم تاوانە ، ئەم هۆیانەش پێ یان دەگوترێت (هۆیە بابەتیەکان) واتا (الاسباب الموضوعية).

## یەکەم هۆیە کەسیەکان

## (الاسباب الشخصية)

### 1- حاڵەتی شاهێد لە ڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتی :

زۆر جار باری دەروونی شاهێد و پێگەی کۆمەڵایەتی کاریگەری زۆریان هەیە لەسەر بەهای قسەکانی، چونکە ئەو شاهێدەی کە گیروگرفتی دەروونی هەیە هەوڵ دەدات کەسانێکی تر تۆمەتبار بکات تاوەکو دەروونی خۆی ئاسوودە بکات !!! هەروەها ئەو کەسەی کە بێ بەش بووە لە پەروەردەیەکی ڕاست و بەدوورە لە بەها کۆمەڵایەتیەکان، زۆر ئاسانە خۆی و ویژدانی خۆی بفرۆشێ بەپارەیەکی کەم .

### 2- پەیوەندی شاهێد بە تۆمەتبار یا بەکەسی تاوانبەرامبەر کراو :

هەندێ جار بوونی پەیوەندی برادەرایەتی و خزمایەتی لەنێوان شاهێد و تۆمەتبار یان نێوان شاهێد و کەسی تاوانبەرامبەر کراو، دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم شاهێدە لە ڕاستی لابدات، یان زیاد و کەمی تیادا بکات بۆ بەرژەوەندی کە ئەو پەیوەندیانەی لەگەڵ هەیە.

3- **ڕق و کینە** (الحقد والكراهية) :- هەندێ جار شاهێد هەندێ قسە دەکات کە هیچ بنەمایەکی ڕاستی تێدا نیە بۆئەوەی تۆمەت بخاتە سەر کەسێك، ئەویش بەهۆی بوونی ڕق و کینە بەرامبەر ئەوکەسە.




4- **زێدەڕۆیی** (المغالات) :- هەندێ جار شاهێد زێدەڕۆیی دەکات لەقسەکانی و بابەت زۆر گەورە دەکات کە پێویستە بەم زێدەڕۆیی و گەورەکردنە ناکات، ئەمەش بۆئەوەیە تا جۆرە گرنگیەك بدەن بەخۆیان .

5- **ترسان** (الخوف):- ترس یان ترسان گرینگترین هۆیە کەپاڵ بە شاهێد دەنێ درۆبکات، چونکە زۆر جار هەندێ تاوانبار هەن کە زۆر ترسناك و خاوەن دەسەلاتن، هەربۆیەش شاهێدەکان لەم تاوانبارانە دەترسن و ڕاستیەکان باس ناکەن، ئەم دیاردەیەش بەشێوەیەکی بەرچاو هەستی پێ دەکرێت لەو شوێنانەی کە دوورن لە سەنتەری بوونی حکومەت و پۆلیس.

6- **خراپ گومان بردن**(سوء الظن) : هەندێ جار شاهێد شایەدی دەدات لە دژی یان لەبەرژەوەندی کەسێك بێ ئەوەی شتێك هەبێ کە شتی پێ بەهستێ یان هەستی پێ کردبێ بەیەکێ لەهەستەکانی بەڵکو تەنها گومانی خراپ دەبات بەم کەسە.

دووەم :- **هۆیە بابەتیەکان (الاسباب المضوعية)** :-

1- **بەرپرسیارێتی وەزیفی** :- ڕەنگە هۆی درۆکردنی شاهێد دوورخستنەوەی بەرپرسیارێتی وەزیفی ئەو بێ، نەوەکو بەکەمتەرخەم تۆمەتبار بکرێت لەکارەکەی ، بۆنمونە : پاسەوانی شەو (الحارس الليلي) کاتێ شاهیدی دەدات لەسەر ڕوودانی دزینی ئەو شوێنەی کە پاسەوانەتیایدا، دەڵێ کە ئەو بەدرێژایی شەو نەنوستووە و کەسی نەبینیوە بێتە ئەم شوێنە کە پاسەوانی دەکات لێ، بەلاَم لەڕاستی دا کاتێ کە تاوانەکە ڕووی داوە ئەو خەڵکە لەخەوێکی قوڵ دابوو.

2- **بەرپرسیارێتی تاوان کاری**(المسؤولية الجنائية) : هەندێ جار شاهید هاوبەشی (شريك) ئەو کەسەیە کە تاوانەکەی کردووە، جا بۆ ئەوەی تۆمەتە لەخۆی و لەم تاوانبارە دووربخاتەوە، هەڵدەستی بەدرۆکردن و شایەدی دانی (زور)، واتا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ تۆمەتەکە لەسەر تۆمەتبار لادات بەشێوەیەکی ناڕاستەخۆش تۆمەتەکە لەسەر خۆی لادەدات .

3- **بەرپرسیارێتی مەددەنی** (المسؤولية المدنية):- وا ڕێك دەکەوێ کە کەسێك شایەدی بەدرۆ بدات بۆئەوەی بەرپرسیارێتی مەدەنی لەسەر خۆی لابدات، بۆنمونە : بەردەستێك تۆمەتبارە بەئەنجامدانی تاوانێك، لێرەدا خاوەن ئەو ماڵەی کە ئەم بەردەستە(خادم)کاری تیادەکات شاهێدی بەدرۆ دەدات،




چونکە تاوەکو بەرپرسیارێتی مەدەنی لەخۆی دووربخاتەوە، چونکە بەپێی یاسا بەرپرسە لە کارەکانی ئەم بەردەستە بەپێی پێویستی (مسؤلية التباع عن الأعمال التابعية) کە لەیاسای مەدەنی باسی لێوە کراوە.

4. **ترسان لە خراپ بوونی ناوبانگ** (سوء السمعة): هەندێ جار شاهێد ناچار دەبن پەنا بۆ درۆبات لەکاتی شایەدی دان، ئەویش لەترسی خراپ بوونی ناوبانگەکەی، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو شایەدی دانەکە پەیوەندی هەبوو بەهەندێ تاوان، وەکو تاوانی ئابرو بردن و شەرەف لەباربردن ، چونکە وادەبینێ کەوا نەبێتە شایەدی لەم تاوانانە.

جا لەباس کردنی هۆکاریە کەسیەکان و بابەتیەکانی کەپاڵ بە شاهێد دەنێن کەوا درۆبکات، بۆمان دەردەکەوێ کەوا دەبێ لێکۆڵێوەر زۆر وریاو دووربین بێت، و بەپێی کەسایەتی و عەقلیەت و پایەیی کۆمەڵایەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ شاهێدەکان بکات، جا هەندێ بارودۆخ وا پێویست دەکات کە لێکۆڵێوەر زۆر نەرم و لەسەر خۆبێ لەگەڵ شاهێدێك، و لەهەندێ بارودۆخی تر واپێویست دەکات کە توند و تووڵ بێ (شدید) لەگەڵ شاهێد ، هەروەها هەندێ جار پێویست دەکات لەگەڵ هەندێ شایەد بە سادەیی مامەڵە بکاتە و لەگەڵ هەندێکی تر بە ڕویەکی گەش و بەپێکەنین هەڵسو کەوت بکات، بۆ ئەوەی متمانەی شاهێد بە دەست بێنێ و ترسی لێ دوربخاتەوە، وە نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێتەوە کە شاهێد مرۆڤە و ڕیزگرتن لێ ئەرکە و دەبێ لەسەر ئەم بنەمایە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.

## پرساندنی تۆمەت بار

### استجواب المتهم

**پرساندنی تۆمەتبار** : بریتیە لە گوێ گرتن لەقسەکانی تۆمەتبار و گفتوگۆکردن لەگەڵی سەبارەت بەو تۆمەتەی کە ئاراستەی کراوە، وە ئەو هەڵوێستەی دەیگرێتە بەر لەڕووی ڕەت کردنەوەی ئەم تۆمەتە یان دانپێنان بەم تۆمەتە.

**یان بریتیە لە** : ڕووبەڕووکردنەوەی تۆمەتبار بەو بەڵگانەی کە کۆکراوەتەوە لەدژی و گفتوگۆ لەگەڵی سەبارەت بەم بەڵگانە، تاوەکو ڕەتیان بکاتەوە ئەگەر هاتوو ڕەتی تۆمەتەکەی کرد یان دان بەڕاستی ئەم بەڵگانە بنێ ئەگەر دانی بەتاوانەکە نا.





لەم پێناسانەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێ، کەپرساندنی تۆمەتبار ڕێ و شوێنێکە دوولایەنەیە : ڕێ و شوێنێکی تۆمەتبارکردنە (إجراء إتهام) و ڕێ و شوێنێکی بەرگری بە (إجراء دفاع) لەیەك كات دا.

**واتا ترساندن بۆ دوومەبەست بەکاردێت : -**

**یەکەم : کۆکردنەوەی بەڵگە بۆ سەلماندنی تۆمەت بەسەر تۆمەتبار .**

**دووەم: کۆکردنەوەی هەرشتێک کە تۆمەت دووربخاتەوە لەسەر تۆمەتبار .**

کەواتا پرساندن ڕێ و شوێنێکە بەمەبەستی بە دیارخستنی ڕاستی و زانینی ئەوکەسەی کەتاوانەکەی کردووە، ئەنجام دەدرێت، نەك بەمەبەستی تۆمەتبارکردنی تۆمەتبار لە ڕێگای بەدەستهێنانی (دانپێنان / الاعتراف) لێ ی ، هەروەك چۆن پێشتر بۆ ئەم مەبەستە ئەنجام دەدرا، چونکە لەکاتی خۆی، مەبەست لە پرساندن تەنها بۆ بەدەست هێنانی دان پێنانی تۆمەتبار ئەنجام دەدرا، هەربۆیە ڕێگا دەدرا بە گرتنە بەری گشت شێوازێك لەشێوازەکانی ئەزیەت دانی جەستەیی و دەروونی دژی تۆمەتبار بەمەبەستی وەرگرتنی دان پێ نانی بەتاوانێك.

بەڵام هەروەك باسمان کرد، مەبەست لەپرساندنی تۆمەتبار گەیشتنە بە ڕاستی، جا ئەگەر لەبەرژەوەندی تۆمەتبار بوو، یاخود لەدژی تۆمەتبار بوو، وەك هەرئەمە، بەڵکو یاسا کۆمەڵێك (ضمانات)ی داناوە لەکاتی پرساندنی تۆمەتبار، تاوەکو ئەم ڕێ وشوێنە ڕێڕەوی دروستی خۆی وەربگرێ کەیاسا دایڕشتووە، کە **بریتین لەمانە کەباسیان دەکەین:**

1- دەبێ جگە لەدادوەری لێکۆڵینەوە و لێکۆڵێوەر هەست بە پرساندنی تۆمەت بار، چونکە ئەم ڕێ و شوێنە زۆرگرینگ و مەترسیدارە، دەبێ کەسێك پێی هەڵبستێ کە جێگای متمانە و باوەڕبێ، هەربۆیە یاسا ئەم دەسەڵاتەی نەداوە بە ئەندامانی ڕێکخستنی دادگەری (أعضاء الضبط القضائي) تەنانەت لەحاڵەتی تاوانی بینراویش(الجريمة المشهودة) بەڵکو ئەم ئەندامانە تەنها بۆیان هەیە پرسیار ئاراستەی تۆمەتبار بکەن بەشێوەی زارەکی لەسەر ئەو تۆمەتەی کە پێی تۆمەتبار کراوە (م 43)ی یاسای (أ ، م ، ج)عێراقی.




2- برگەی (ب) لە ماددەی(123) ی یاسای (أ.م.ج) کە بەبڕیاری ژمارە(1483)ی ساڵی (2003) زیاد کراوە بۆ یاسای (أ.م.ج) عێراقی لەلایەن دەسەڵاتی کاتی عێراقی، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە پێویستە لەسەردادوەری لێکۆڵینەوە پێش ئەنجام دانی لێکۆڵینەوەکە لەگەڵ تۆمەتبار ئەمانەی خوارەوەی پێ ڕابگەیەنێ:

أ- بۆی هەیە و مافی ئەوەی هەیە بێ دەنگ بێ، واتا بۆی هەیە وەڵامی پرسیارەکانی لێکۆڵیوەر یان دادوەری لێکۆڵینەوە نەداتەوە، وە ئەم بێ دەنگیەش بەبەڵگە لەدژی ئەو دانانـدرێت، چونکە بێ دەنگی(السکوت) کافی تۆمەتبارە، بۆی هەیە ئەم مافە بەکاربێنێ و بۆی هەیە بەکاری نەهێنێ.

ب- مافی ئەوەی هەیە کە نوێنەرایەتی بکرێت لەلایەن پارێزەرێك، واتا بۆی هەیە پارێزەرێك بۆخۆی دیاری بکات، جائەگەر هاتوو توانای دارایی نەبوو کە پارێزە بگرێت، ئەوا پێویستە دادگا پارێزەرێکی بۆ دیاری بکات بێ ئەوەی کرێ ی ماندووبونی ئەم پارێزەرە بکەوێتە سەر شانی ئەم تۆمەتبارە.

ت- لەسەردادوەری لێکۆڵینەوە یان لێکۆڵیوەر پێویستە بابەتی(ئارەزووی تۆمەتبار لە دیاریکردنی پارێزەر) یەکلایی بکاتەوە پێش دەست کرن بە لێکۆڵینەوە، وە لەحاڵەتێك ئەگەر تۆمەتبار ئارەزووی خۆی دەربڕی بەوەی کە دەیەوێ پارێزەر بگرێت و ببێتە وەکیلی ئەو، ئەوا لێرەدا ناوی دادوەری لێکۆڵینەوە یاخود لێکۆڵیوەر هیچ و ڕێ و شوێنێك ئەنجام بدات تا تۆمەتبار ئەم پارێزەرە تەوکیل دەکات.

3- نابێ بەهیچ شێوەیەك تۆمەتبار سوێندی یاسایی بدرێت (م 126 / أ) محاکمات، مەگەر کە حاڵەتێك ئەگەر وەکو شاهێد داندرا بۆئەوەی شایەدی لەسەر تۆمەتبارانی تر بدات.

چونکە سوێند خواردن وەکو گوشارێکی مەعنوی و ئەخلاقی دادەنرێت و ڕووبەڕووی تۆمەتبار دەکرێتەوە، هەربۆیە کاریگەری لەسەر ویستی ئەم تۆمەتبارە دەکات.

4- نابێ هیچ ئامرازێك بەکاربهێنرێت کە گوشار(ضغط) دەکاتە سەر ویستی (إرادة) تۆمەتبار ناچاری دەکات کە دان بە شتێك بنێ کە نایەوێ دانی پێ بنێ، وەکو : مامەڵەی خراپ لەگەڵ تۆمەتبار، ئەشکەنجەدانی، هەڕەشە لێکردن بە ئەشکەنجەدانی، پەیمان پێ دانی(وعد)، کاریگەری دەروونی، بەکارهێنانی مادەی سەرخۆشکەر و بێ هۆشکەر ... هتد.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لەکاتی ئەنجامدانی هەندێ تاوانی ترسناك و مەترسیدار کە لەلایەن چەند تاوانبارێك ئەنجامدرابێت و لێکۆڵینەوەی لەم جۆرە تاوانانە بگاتە ڕێگایەکی داخراو، لەبەر نەبوونی






بەڵگەی بەهێز بۆ تۆمەتبارکردنی ئەنجامدەرانی ئەم جۆرە تاوانانە، وە بەمەبەستی گەیشتن بە ڕاستیەکان و ئاشکراکردنی تاوان و ئەنجامدەرانی، ماددەی (129) ی یاسای (أ . م . ج) عێراقی ڕێگای داوە بە دادوەری لێکۆڵینەوە بەڕەزامەندی دادگای جنایات کە لێ خۆشبوون(العفو) پێشکەش بەیەکێ لە تۆمەتباران بکات(عرض العفو على المتهم) لەبەرامبەر وەرگرتنی شایەدی ئەم تۆمەتبارە لە دژی تۆمەتبارانی تر، بەمەرجێك ئەو زانیاریانە ڕاست و تەواو بن. جالێرەدا، هەرچەندە قسەکانی ئەم تۆمەتبارە وەکو شاهێد وەردەگیرێت، بەلاّم هەر صفەتی(تۆمەتبار)ی هەیە، هەر بەم صفەتە دەمێنێتەوە تا بڕیار دەردەچێت لەم داوایە.

جا ئەگەر هاتوو ئەو زانیاریانەی یان ئەو شایەدیەیی کە ئەم تۆمەتبارە دەیدات تەواو نەبوو وە بەئەنقەست هەندێ زانیاری گرینگی شاردەوە، یاخود درۆی کرد لەشایەدیەکەی، ئەوا مافی لێبوردن(العفو) و کە هەڵدەوەشێتەوە بە بڕیارێك کە لە دادگای جنایات دەردەچێت و سەر لەنوێ ڕێ و شوێنی لەدژی دەگرێتەبەر و ئەوقسانەی کە کردوویەتی بە بەڵگە لەدژی دادەنرێت، بەلاّم ئەگەر ڕاستگۆ بوو لەقسەکانی، ئەوا دادگای جنایات بڕیارێك دەردەکات بەڕاوەستاندنی گشت ڕێ و شوێنێکی یاسایی لە دژی بڕیاری بەئازادکرنی دەردەکات.

5- پێویستە لەسەر دادوەری لێکۆڵینەوە یان لێکۆڵێوەر کە پرساندن لەگەڵ تۆمەت بار بکات لەماوەی (24) کاتژمێر لەوکاتەاشی ئامادە دەبێت لەبەردەمی و پاش دڵنیابوون لە کەسایەتییەکەی و ئاگادار کردنەوەی لەو تاوانەی کە خراوەتە پاڵی.

6- تۆمەتبار بۆی هەیە قسەکانی لەهەرکاتێك بکات لەپاش گۆ گرتنی لەقسەکانی هەر شاهێدێك، وە بۆی هەیە گفتوگۆ لەگەڵ ئەم شاهێدە بکات، وەیان بۆی هەیە کە داوای هێنانی ئەم شاهێدە بکات تا شایەدی بدات.

7- دەبێ ئیفادەی تۆمەتبار لەلایە دادوەری لێکۆڵینەوە یان لێکۆڵێوەر لە(محضر )ی لێکۆڵینەوە بنووسرێتەوە، وە لەلایەن ئەو تۆمەتبار واژوو بکرێت، وەئەگەر تۆمەت بار ڕەتی کردەوە واژوو بکات لەسەر ئیفادەکەی، جا دەبێ ئەم ڕازی نەبوونە لەلایەن دادوەری لێکۆڵینەوە یان لێکۆڵێوەر لە(محضر )ی لێکۆڵینەوە دیاری بکرێ لەگەڵ هۆی ئەم واژوو نەکردنە.




وەئەگەر تۆمەتبار ویستی ئیفادەکەی خۆی بەخۆی بنووسێتەوە، ئەوا پێویستە دادوەر ڕێگای پێ بدات، بەلآم دەبێ ئەم کارە بە ئامادەبوونی دادوەر ئەنجام بدرێت، وە ئەم کارە (واتا نووسینەوەی ئیفادەکە لەلایەن تۆمەتبار) لە (محضر) ەکە دیاری بکرێت و ئینجا لەلایەن تۆمەتبار و دادوەر واژوو بکرێت.

## ڕێسا گشتیەکانی پرساندنی تۆمەتبار

## (القواعد العامة في الاستجواب)

### یەکەم : زانین بەگشت لایەنەکانی ڕوودانی تاوان .

دەبێ لێکۆڵێوەر زانیاری و زانینی هەبێ بەگشت لایەنەکانی ڕوودانی تاوان بە شێوەیەکی تێرو تەسەل، ئەویش لەڕێگای پێداچوونەوە بەگشت (محاضر )ی لێکۆڵینەوە بۆئەوەی بتوانێ چ جۆرە پرسیارێك ئاراستەی تۆمەتبار بکات و لەچ خالێك گفتوگۆی لەگەڵ بکات بۆئەوەی بتوانێ بەراورد لەنێوان وەلآمی تۆمەتبار بکات لەگەڵ ئەو بەلگانەی کە دەست کەوتوون لەئەنجامی کەشف کردنی شوێنی ڕوودانی تاوان، هەروەها شێوازی ئەنجامدانی تاوان و ئەو هۆیانەی کە پالێان داوە کەئەم تاوانە بکات .... هتد ، چونکە شارەزایی و نەزانین بەیەکێ لەلایەنەکانی تاوان، ڕەنگە ببێتە هۆی لەدەست دانی هەلی گەیشتن بە زانینی ڕاستیەکان، جا ئەگەر هاتوو لێکۆڵێوەر ئەم زانیاریانەی بەتەواوەتی لەسەر تاوانەکە نەبوو، ئەوا ڕەنگە تۆمەتبار کەلێنێك (ثغرة) بدۆزێتەوە و لەم پرساندنە دەربازی بێت، ئەویش بەهۆی کەمی زانیارییەکانی لێکۆڵێوەر سەبارەت بەلایەنەکانی بێت، ئەویش بەهۆی کەمی زانیارییەکانی لێکۆڵێوەر سەبارەت بەلایەنەکانی لە ڕوودانی ئەم تاوانە.

### دووەم: خوێندنەوەیەکی سەرتاسەری کەسایەتی تۆمەتبار لەگشت لایەنەکانەوە.

ئەمەش لەڕێگای بەدەستهێنانی زۆرترین زانیاری سەبارەت بە تۆمەتبار، وەکو خێزانی (عائلة) ئەم تۆمەتبارە، ژمارەی ئەندامانی خێزانەکەی، ئەو پیشەی کەئەنجامی دەدات، پێگەی کۆمەلآیەتی، ئایا پێشتر تاوانی کردووە، ئەو تاوانانە چین ئەنجامی داوە، ئەو بەندیخانانەی کە تیایدا بووە، .... هتد، بەواتایەکی تر هەر زانیاریەك کە دەبێتە هۆی دیاریکردنی کەسایەتی تۆمەتبار.



جا ئەم خوێندنەوەی ژیانی تۆمەتبار یەکجار گرنگە، چونکە یارمەتی لێکۆڵیوەر دەدات بۆزانینی بارودۆخی جەستەیی و دەروونی ئەم تۆمەتبارە کە پرساندنی لەگەڵ دەکات، هەروەها یارمەتی لێکۆڵیوەر دەدات خاڵە لاوازەکانی ئەم تۆمەتبارە دیاری بکات لەکاتی لێکۆڵینەوە سوودی لێ وەردەگرێت کاتی پرساندنی ئەنجام دەدات.

جا ئەگەر هاتوو تۆمەتبار بۆی دەرکەوت کە لێکۆڵیوەر زانیاریەکی تەواوی هەیە لەسەر کەسایەتی ئەو لەسەر تاوانەکە، ئەوا تووشی شلەژان دەبێت و وای لێ دەکات هێزی ئەوەی نەمێنێ کە بەردەوام بێت لەبەرگری کردن و بەردەوام بوونی لەسەر ڕەت کردنەوەی تۆمەتەکە، وە دەرخستنی ڕاستیەکان زۆر ئاسانتر دەبن.

## سێیەم : – پەلەکردن لەپرساندنی تۆمەتبار :–

لەبنەڕەتدا وایە کە پرساندنی تۆمەتبار یەکسەر ئەنجام بدرێت پاش زانینی ئەو تۆمەتبارەی کە تاوانێکی ئەنجام داوە، وە ئەنجامەکەی باشترە، چونکە چەند ماوە تێ پەڕێ بەسەر ڕوودانی تاوان، ئەوەندە هەستی تاوانبار کز دەکات سەبارەت بە تۆمەتبارکردنی وای لێ دەکات سەر لەنوێ بیر لە بەرپرسیارێتی بکاتەوە.

لەلایەکی تر پەلەکردن لە پرساندن، یارمەتی کەسی بێ تاوان دەدات کە تۆمەت بار کراوە، زۆر بەرگری لەخۆی بکات و ڕەتی ئەوبەڵگانە بکاتەوە کە لەدژی ئامادەکراوە، چونکە بەردەوام بوونی ئەم لەدژی کاردەکاتە سەر ناوودەنگی (السمعة)هەروەها لەئازادی بێ بەشی دەکات ئەگەر هاتوو (توقیف)کرا

جا لەپاڵ ئەم ڕێسا گشتیانەی کە باسمان کرد، هەندێ ڕێسای بنەڕەتی تر هەیە کە تێرو تەسەلتر وفراوانتر پێویستە لێکۆڵیوەر لەبەرچاویان بگرێت، وە ئەم ڕێسایانە هەندێکیان پەیوەندیان هەیە بو(لێکۆڵیوەری) کە پرساندنەکەی ئەنجام دەدات، وەهەندێکی تر پەیوەندیان هەیە بە (شوێنە)ی پرساندنەکەی لێ ئەنجام دەدرێت، وە هەندێکیان پەیوەندیان هەیە بەو (پرسیارانەی) کە بەکاردێت

## یەکەم : ئەوڕێسایانەی کە پەیوەندیان هەیە بەلێکۆڵیوەر :–

1- پرساندن کارێکە ئەوکەسە ماندوو دەکات کەپێی هەڵدەستی ، جا ئەگەر لێکۆڵیوەر خۆی ئامادەنەکرد لەهەردوو لایەنی دەروونی و جەستەیی، ئەوامانای ئەوەیە کە وەلام بەدەست ناهێنێ




بەشێوەیەکی دروست، هەربۆیە دەبێ لێکۆڵیوەر بەووڕەیەکی باش و توانایەکی دەروونی و جەستەیی ئەم کارە ئەنجام بدات.

2- دەبێ لێکۆڵیوەر زۆر ئازاو چاونەترس بێ و خاوەن ئارامی بێ (صبر) چونکە ئەوە وای لێدەکات کە ئەو دەست پێشخەربێت و جڵەو لەدەستی ئەو بێت کاتێ ئەنجامی دەدات، وە بەپێچەوانەش ئەگەر وانەبوو ئەوا تۆمەت بار کەسایەتی خۆی دەسەپێنێ بەسەر لێکۆڵەر، تەنانەت وای لێ دێت کە ئەو پرساندن لە لێکۆڵیوەر بکات و ئەم پرساندنە بەدەست تۆمەتبار بێت، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو لەو تاوانبارانە ڕاهاتوون لەتاوان کردن.

3- پێویستە لەسەر لێکۆڵیوەر بەگرنگییەوە گرێ لەتۆمەتبار بگرێت لەکاتی پرساندنی و دووردەکەوێتەوە لەهەر شتێك کە ببێتە هۆی ئەوەی کە تۆمەتبار هەست بکات کە گوێ ی لێ ناگیرێت یان گرینگی بەقسەکانی نادات.

4- نابێ لێکۆڵیوەر وانیشان بدات کە ئەو تەنها مەبەستی بەدەست هێنانی دانپێدانانی تۆمەتبار بێ، بەڵکو دەبێ شێوەی لێکۆڵیوەر وانیشان بدات کە ئەو دەیەوێ بگاتە ڕاستیەکان.

5- پێویستە لێکۆڵیوەر گشت کەرەستەکانی نوسینەوە و تۆمارکردن (الکتابە لتسجیل) بشارێتەوە بەشێوەیەك کە دوور بێ لەچاوی تۆمەتبار و هەستی پێ یان نەکات تاوەکو تۆمەتبار وابیرنەکاتەوە کە گشت قسەکانی تۆمار دەکرێت و ڕەنگە لەدژی بەکاربێت.

6- واباشترە هەندە ووشە کاریگەر بەکاربێت وەکو (کوشتن ، اغتصاب ،،، هتد) وەهەندێ جار ووشەی سوکتر بەکاربێت لەجیاتی ئەم ووشانە ، وەکو ڕووداو حادسە، هاویشتنی گوللە ، اطلاق النار، چونکە ئەم ووشانە یەك مانا دەبەخشێت، بەڵام کاریگەری کەمترە لەڕووی دەروونی تۆمەتبار، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو تۆمەتبار کچ بوو یان لاوێکی تازە پێ گەیشتوو بوو.

7- پێویستە لەسەر لێکۆڵیوەر متمانەی(ثقة) تۆمەتبار بەدەست بێنێ، چونکە یارمەتی ئەوە دەدات کە زانیاری لێ وەردەگرێت کە سوودی هەیە بۆ لێکۆڵینەوە، بۆنمونە : وا باشە لێکۆڵیوە لەنزیك تۆمەتبار دابنیشێت، یان ماوەی پێ بدات کە باسی گیروگرفتی تایبەتی خۆی بۆ لێکۆڵیوەر بکات ، ... هتد ، چونکە ئەم ڕێگایە هیچ بەربەستێکی دەروونی نیوان تۆمەتبار و لێکۆڵیوەر نایەڵێ و وا لە تۆمەتباردەکات هاوکاری لێکۆڵیوەر بدات لەکاتی ئەنجامدانی پراساندن.




8. پێویستە لەسەر لێکۆڵێوەر لەکاتی پرساندنی تۆمەتبار، ئاگاداری قسەکانی تۆمەتبار بێت تاوەکو تێبینی گۆڕانکاری کە بەسەر تۆمەتبار دادێت، وەکو : شێوەی دەم و چاوی، گۆڕانی ڕەنگی، وەهەرهەڵچوونێکی تر کەبەسەر جەستەی دا دێت.

9. دەبێ لێکۆڵێوەر بە دووربێ لەبەکارهێنانی هەڕەشە و توندوتیژی لەکاتی پرساندن چونکە ئەمە کارێکی نامرۆڤانەیە، ڕەنگە پاڵ بە تۆمەتبار بنێ ئیعتراف بکات بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت لەم ئەشکەنجەیە.

10. ئەگەر هاتو زیاتر تۆمەتبارێك هەبوو، واباشترە لێکۆڵێوەر دەست بە پرساندن بکات لەگەڵ ئەو تۆمەتبارەی کە تازە هاتۆتە ناو تاوان، وەئەو تۆمەتبارەی کە زۆرترین ڕۆڵی بینیوە لە ئەنجامدانی تاوان ...هتد ، چونکە لەڕێگای ئەم دووانە لێکۆڵێوەر زانیاری بەسوودی دەست دەکەوێت کە یارمەتی دەدات بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی تۆمەتباری تر.

11. پێویستە لێکۆڵێوەر لەگەڵ هەریەك لە تۆمەتباران بەجیا پرساندن ئەنجام بدا وەئەگەر لێکۆڵینەوەکە پێویستی کرد، ئەوا دەتوانرێ تۆمەتباران ڕووبەڕووی یەك بکاتەوە.

## دووەم : ئەو ڕێسایانەی کە پەیوەندیان هەیە بەشێوەی پرساندن : —

1. واباشترە پرساندن لەشوێنی ڕوودانی تاوانەکە ئەنجام بدرێت هەرچەندی کرا، چونکە ئەوە وادەکات تۆمەتبار بێتە نێو بارودۆخی تاوانەکەو وای لێدەکات کەوێنەیەکی ڕاستی لەسەر تاوانەکە هەست پێ بکات ، ئەمە ، لەپاڵ ئەوەی کاریگەری تێدەکات لەڕووی دەروونیەوە وای لێدەکات بەشێوەیەکی (تلقائي) قسەبکات.

2. ئەگەر نەکرا پرساندنەکە لەشوێنی ڕووداوەکە ئەنجام بدرێت ئەوا ئەم کارە لەژوورێکی تایبەت بە پرساندن ئەنجام دەدرێت، کە دەبێت هەندێ مەرجی تێدابێت وەکو :1- سادەیی لە شت و مەکەکان (اثاثات)، نەبوونی هیچ وێنەیەك یان (تمثال)یان ڕەنگە سەرنج ڕاکێشەکان بەتایبەتی ڕەنگی(سور) کە ببێتە هۆی سەرنج ڕاکیشانی تۆمەتبار.

3. ڕێگە نەدان بەهاتنە ژوورەوەی هیچ کەسێك بۆ ژووری پرساندن لەکاتی ئەنجام دانی پرساندن لەگەڵ تۆمەتبار ، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ڕێگرتن لە تۆمەت بار لەسەر لەنوێ ڕێکخستنەوە و قسەکانی تاوەکو لێکۆڵێوەر پێی فری و بدات، لەلایەکی تر زۆر جار تۆمەتبار دان بەتاوانەکەی نانێ ئەگەر




هاتوو چەند کەسێك ئامادەبوون لەکاتی ئەنجام دانی پرساندن، بۆنمونـە : بـوونی دایـك و بـاوك یـان خزم و دۆست لەشوێنی پرساندن وا لەتۆمەت بار دەکات کە قسەی ڕاست نەکات و اعتراف نەکات.

**سێیەم : – ئەو ڕێساییانەی کە پەیوەندیان هەیە بە پرسیارەکان و چۆنییەتی ئاڕاستە کردنیان :–**

1- سەرەتا دەبێ پرساندن بەهەندێ پرسیار دەست پێ بکات سەبارەت بەحاڵەتی تەمـەنی تۆمـەتبار، وەکو ناو ، ناونیشان، باری خێزان ، فەرمان بەرە یان کارێکی تر دەکات ... هتد ، ئەمەش بۆ ئەوەیە تاوەکو دڵنیابین لەکەسایەتی ئەم کەسە هەروەها تێگەیشتن لەکەسایەتییەکە و هەڵسەنگاندنی .

2- واباشـە سـەرەتا لێکۆڵێـوەر تۆمەتەکە بەئەنجامـدانی تاوانەکـە ڕووبـەڕوی تۆمـەتبار نـەکات، بـەڵکو هەندێ پرسیاری پێشەکی لێبکات(تمهید) ئینجا هـەنگاو بەهـەنگاو تۆمەتەکەی پـێ بڵـێ، بۆنمونـە : سەرەتا پێی بڵێ: دەزانی بۆ دەستگیر کراوی ؟ ئایا زانینـت هەیـە کە فلانـە تـاوان ڕووی داوە ؟ جا ئەگەر هاتو وەڵامی بە (بەڵێ) دایەوە ئینجا لێی ببپرسێت چۆنت زانـی ؟ لـە چ ڕێکـەوتێنك زانیـت؟ وە ئەگەر هاتوو وەڵامی (بەنەخێر) دایەوە پرسیاری لێبکات : ئـەو هۆیانـە چـین کـە تـۆ تۆمـەتبار کراوی بەو تاوانە ؟ لەکاتی ڕوودانی تاوانەکە تۆ لەکوێ بووی .... هتد.

3- دەبێت پرسیارەکانی ڕیزبەند کراوبن بە پێ ی مێـژووی ڕوودانـی تاوانەکـە ، چونکە ئـەوە وادەکات تۆمـەتبار بـاس لـە ڕووداوەکە بکات بەشێوەیەکی ڕیزبەنـد سـەرە ڕای ئـەوەی کـەلێکۆڵێوەر شارەزا دەبێت بەگشت قۆناغەکان کە تاوانەکە پێی تێپەڕیوە.

4- واباشـترە کـە پرسـاندنەکە بـە هەنـدێ پرسـیار دەسـت پـێ بکات کەتایبەتـە بـە بابـەتی تاوانەکـە بەشێوەیەکی گشتی ، ئینجا پرسیارە وورەدەکارییەکان ئاڕاستەی تۆمەت بار بکرێـتً بـە پەیوەنـدیان هەیە بە ووردەکارییەکانی تاوانەکەوە، ڕەنگە تۆمەتبار باسی نەکردبێ بەشێوەیەکی تێر و تەسەل.

5- دەبێ پرسـیارەکان کـورت و دیـاری کـراوو ڕون بـن تـاوەکو بەئاسـانی لێـی تێبگـات، هـەروەها تـاوەکو وەڵامی ڕاست و ڕوونمان دەست کەوێ لەتۆمەتبار واتا نـابێ وەڵامـەکان بـواری شـیکردنەوەیان هـەبێ یـان زیـاتر لـە مانایـەك ببەخشـێت، تـاوەکو ڕێگـا لەبـەردەم تۆمـەتبار بگـرین بۆئـەوەی لەقسـەکانی پاشگەز نەبێتەوە.

6- پێویستە لەسەر لێکۆڵێوەر پرسیاری وەڵامدەر (تلقین) ئاڕاستەی تۆمەتبار نەکات.

7- دەبێ پرسیار و وەڵامەکان لە(محضر) بنووسێتەوە.

**جا ئەنجامی ئەم پرساندنە لەگەڵ تۆمەتبار یەکێ لەم دووحاڵەتەی لێدەکەوێتەوە :-**

1- یان دان بەو تۆمەتە دەنێ کە خراوەتە پاڵی

2- یان ئەوەتا حاشای لێدەکات و دانی پیا نانێ

**ئەم دووحاڵەتەش لەوانەکانی دادی باسی دەکەین.**

## دان پێنانی تۆمەتبار

## (اعتراف المتهم)

دان پێدانان واتا بڕیار دانی(اقرار) تۆمەتبار لەسەر خۆی بەهەمو یان بەشێك لەوتۆمەتانەی کەخراوەتە پاڵی

وە شێوەی دان پێدانان دووجۆرە :-

نوسراو یاخود زارەکی ، جا دان پێدانانی نووسراو یان ئەوەتا لەلایەن تۆمەتبارەوە دەنوسرێت و واژۆ دەکرێت ، یان ئەوەتا لەلایەن کەسێکی تر دەنوسرێت و تەنها لەلایەن تۆمەتبار واژوو دەکرێت، وە دان پێدانانی زارەکی بریتیە لەو قسانەی کە تۆمەتبار دەیکات لەبەردەم دەسەلآتی لێکۆڵینەوە .

لەڕووی بەهای یاسایی دانپێدانانی نووسراو بەهای یاسایی زیاتر و بەهێزترە، لەدان پێدانانی زارەکی چونکە زۆر جار هەیە ئەو تۆمەتبارەی کەبەشێوەی زارەکی دانی بەتاوان ناوە پاشگەز دەبێتەوە لەو دان پێدانانە وە بیانو بۆ ئەوە دێنێتەوە کە ناچار کراوە، لەسەر ئەم دانپێدانانە لەڕێگای بەکارهێنانی هەڕەشە و زۆر لێکردن، جا پێویستە لەسەر لێکۆڵێوەر پەلە بکات لە نووسینەوەی دانپێدانانی تۆمەتبار و ئینجا ڕێگای پێ بدات بیخوێنێتەوە یان بۆی بخوێنێتەوە وە واژووی پێ بکات، تا هەلی پاشگەز بوونەوە لە تۆمەتبار بگرێت ئەگەر ویستی حاشای لێبکات لەبەردەم دادوەر، پێویستە دان پێدانان پەیوەندی ڕاستەو خۆی هەبێ بەو تاوانەی کەلێکۆڵینەویە لەسەر دەکرێ ، بەواتایەکی تر دان بەو تاوانە بنێ کەڕووی داوە بۆنمونە : کاتێ تۆمەتبار دان دەنێ بەوەی کە پەیوەندی نامەشروعی هەبووە لەگەڵ ژنێکی کوژراو بێ ئەوەی دان بەکوشتنی ئەم ژنەدا بنێ، لەم نمونەیە ئەوە بە دانپێدانێکی یاسایی دانانرێت، چونکە تۆمەتبار دانی نەناوە بە کوشتنی ئەم ژنە، بەڵکو دەکرێ وەکو شتێکی سوود مەند سوودی لێ وەرگیرێت بۆمەبەستی لێکۆڵینەوە ، کەڕەنگە ئەم پەیوەندییە نامەشروعە هۆیەك بێ بۆ کوشتنی ئەم




ژنه، جێی ئاماژەیه هەرچەنده دان پێدانان وەکو جاری جاران سەیری ناکرێ، وەکو (سید الأدلة)بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاوەکو ئەمرۆ بەهایەکی یاسای گرنگی هەیه ، چونکه هیچ بەڵگەیەك ئەوەنده بەهێز نییه که مرۆڤ دان بەوەدابنێ کەتاوانی ئەنجام داوه، بەتایبەتی ئەگەر ئەم دانپێدانانه چەند مەرجێکی تێدا بوو که ئێستا دێینه سەر باسیان :-

## مەرجەکانی دانپێدانان

## (شروط الاعتراف)

بۆئەوەی دانپێدانان وەکو بەلگەیەك بەکاربێت بۆسەلماندنی تاوان پێویسته ئەم مەرجانەی تێدابێت:-

1- **دەبێت دانپێدانانەکه دەرچوو بێت لەلایەن کەسێک که تۆمەتبار کراوه بەئەنجامدانی تاوان**:- بۆئەوەی دانپێدانان بەڕاست و قەبولکراو دابنێت، پێویسته دەربچێت لەلایەن کەسێك کەکاتی ئەم دانپێدانانه تۆمەتبار کرابێت بەئەنجامدانی تاوان، هەربۆیه هەرقسەیەك که دەربچێ لەلایەن ئەوکەسه پێش تۆمەتبار کردنی ئەوا بەدانپێدانان دانانرێت، هەربۆیه مادەی (123) لەیاسای (أ م ج) فەرمانی داوه که دەبێ دادوەر یان لێکۆڵەوەر لەکاتی پرساندنی تۆمەتبار ئاگاداری بکاتەوه لەو تۆمەتەی که خراوەته پاڵ ئەم کەسه تاوەکو لەم تۆمەتەبگات کەخراوەته پاڵی و بزانێ واتاو مەودای دانپێدانانەکەی چییه.

2- **دەبێ دان پێدانا لەبەردەم لایەنێکی تایبەت مەند ئەنجام بدرێت** :- بەپێی برگەی (أ) لەماددەی (217) ی یاسای (أ ، م ، ج) ئەو لایەنەی که تایبەت مەنده بە وەرگرتن و دەرچونی دان پێدانان لەبەردەمی دوولایەن: دادوەری لێکۆڵینەوه و دادگا، هەربۆیه ئەگەر هاتوو دان پێدانان ئەنجام بدرێت لەبەردەم ئەفسەری پۆلیس، ئەوا ئەم دانپێدانانه نابێته بەلگەیەکی سەلمێنراو وه دادگا پشتی پێ نابەستی بەڕاست دانانرێت.

لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەدات :ئایه هێزی یاسای ئەو دان پێدانانه چییه که لەبەردەم لێکۆڵیوەر (محقق) ئەنجام دەدرێت ؟

هەروەك باسمان کرد لایەنی تایبەت مەند بەوەرگرتنی دانپێدانان تەنها دادگا و دادوەری لێکۆڵینەوەیه ، بەڵام بەدەر لەمه (الاستثناء) کراوه هەمان برگەی سەرەوه (واتا برگەی (أ) ی مادەی (217) ) ڕێگای




داوە بەدادگا کە پشت ببەستێ بەو دانپێدانانەی کەلەبەردەم لێکۆڵێوەر دەرچووە، ئەویش لەیەك حاڵەت ئەو حاڵەتەش ئەوەیە : ئەگەر هاتوو سەلمێنرا بۆ دادگا بەبەڵگەیەکی (مقنع) کە لێکۆڵێوەر ماوەیەکی گونجاوی بەدەست نەبووە بۆئامادەکردن و هێنانی تۆمەتبار بۆ بەردەم دادگەری لێکۆڵینەوە، تاوەکو دان پێدانانەکەی بنوسێتەوە.

کەواتا ، بەشێوەیەکی گشتی دان پێدانان لەبەردەم لێکۆڵینەوە بەهای یاسای نییە، بەلاّم (استثناء) لەیەك حاڵەت ئەم بەهایە یاسایی دەبێت کاتێ دەسەلمێندرێ کە لێکۆڵێوەر ماوەیەکی گونجاوی نەبووە بۆ هێنانی تۆمەتبار بۆ بەردەم دادوەر.

3- **دەبێ دان پێ نان(صریح) و ڕوون بێ (واضح)** :- دەبێ دان پێنانی تۆمەتبار ڕوون و ئاشکرا بێ و نابێ چەند واتایەك یان چەند شی کردنەوەیەك هەلگرێ، بەلکو دەبێ تۆمەتبار بەشێوەیەکی ڕوون و ڕاستەو خۆ دان بەتاوانەکەی بنێ، هەر بۆیە کۆکردنەوەی چەند قسەیەکی تۆمەتبار کە لەچەند پرسیار ئاڕاستەکراو بۆی لەکاتی پرس، بەدان پێ نان داناندرێت.

هەروەها نابێ سەرچاوەی دان پێ نان چەند هەڵس و کەتێکی تۆمەتبار بێ، وەکو بێ دەنگی تۆمەتبار یاخود وەلاّمنەدانەوەی ئەو پرسیارانەی کە ئاڕاستەی کراوە، یاخود هەلاّتنی تۆمەتبار پاش دەستگیر کردنی ... هتد .

4- **دەبێ دان پێ نان دەربچێ لەلایەن کەسێک کەخاوەنی ویست و ئیرادەیەکی ئازاد بێ** :- واتا دەبێت دان پێ نان دەربچێ لەلایەن کەسێکی خاوەن ویستێکی ئازاد و خاوەن (تمیز)، هەربۆیە گوێ لەو دان پێنانە ناگیرێت و بەهای یاسایی نییە ئەگەر هاتوو لەکەسێکی شێت دەربچێ یان لەکەسێك دەربچێ کەلەژێر کاریگەری ماددەی بێ هۆش کەر دایە (مخدر)، یاخود لەژێر پاڵە پەستۆی بەزۆر لێ کردن دابێ (الاکراه) بەهەردو جۆری زۆر لێکردن : ماددی و مەعنەوی.

نموونە لەسەر زۆر لێکردنی ماددی : هەر جۆرە کارێکی توندو تیژی کە ئەنجام دەدرێت لەسەر لاشەی تۆمەتبار ، وەکو : لێدان ، ئەشکەنجەدانی ... هتد.

نموونە لەسەر زۆری لێ کردنی مەعنەوی : هەڕەشە لێ کردن، پەیمان پێ دان بەواتایەکی تر، هەر پاڵە پەستۆیەك کە ئەنجام دەدرێت لەسەر ویستی تۆمەتبار و ئازادی هەڵبژاردنی(حریة الاختبار)




کەواتا هەر دان پێ نانێك دەربچێ بەهۆی زۆر لێ کردنی ماددی یان مەعنوی، ئەوا ئەم دان پێ نانە(باطل) ەو هیچ بەهایەکی یاسایی نییە.

جێی ئاماژە بۆکردنە، ماددەی (218) ی یاسای (أ . م . ج) عێراقی، ڕێگەی داوە بەدادگا ئەو دا پێ نانە وەرگرێت کە لەئەنجامی بەکارهێنانی زۆر لێ کردنی ماددی و مەعنەوی دەرچووە، ئەگەر هاتوو چەند بەلگەیەکی تر هەبوو کە ئەم دان پێ نانە پشت ڕاست دەکردەوە(أيد بأدلة اخرى) یاخود ئاشکرا کردنی ڕاستی.

لەڕاستیدا ئەم ماددەیە جێی ڕەخنەیەکی زۆرە، چونکە دەبێتە هۆی لەناوبردنی ماڤ تۆمەتبار، وە بەپێچەوانەی ئەم پرێنسیپپە یاساییە کە دەڵێ (المبني على الباطل باطل) بەلام ئەوە جێی دلخۆشیە، کە ئەم ماددەیە لەلایەن دەسەلاتی مەدەنی کاتی لەعێراق هەلوەشایەوە و ئێستا کاری پێناکرێت، کەواتا دان پێ نانێك کە لەژێر زۆری لێ کردن دەربچێ، ئەوا ئەم دان پێ نانە دروست نییە و(باطلة)

## دان پێنانی ناڕاست (درۆ)

## (الاعتراف الكاذب)

دان پێنانی تۆمەتبار بەویست و ئارەزووی خۆی، مانای ئەوە نییە کەئەم دان پێ نانە ڕاستە، چونکە لەچەندین کێشەو ڕووداوو دەرکەوتووە کە زۆرێك لە تۆمەتباران دان بەتاوان دادەنێن لەسەر خۆیان لەگەل ئەوەش بێ تاوانن، جا چەندین هۆ هەیە کە پاڵ بەو کەسەوە دەنێ کە ئەم جۆرە دان پێنانە ناڕاست و درۆ بکات، لێرەدا هەندێکیان باس دەکەین :

1. خراپی مامەڵەی لایەنی لێکۆڵینەوە لەگەل تۆمەتبار
2. هەندێ جار بەرژەوەندی خێزان یاخود خزمایەتی وا لەکەسێك دەکات و پالی پێوە دەنێ بۆ دان پێ نان لەسەر خۆی و دوورخستنەوەی تاوان لەسەر تاوانباری ڕاستەقینە .
3. زۆرجار هەژاری و کەم دەرامەتی دارایی دەبێتە هۆیەك و پاڵ بەکەسێك دەنێ تاوەکو تاوانەکە بخاتە سەر شانی خۆی و دان بە تاوانێك دەنێ کە ئەنجامی داوە، ئەویش لەبەرامبەر پێدانی برێك پارە یان بەرێوەبردنی خێزانەکەی لەماوەی بەندکردنی، لەلایەن تۆمەتباری ڕاستەقینە کە ڕەنگە کەسێکی سەرمایەدار بێ یان خاوەن دەسەلات بێ.




4- هەندێ جار ناوبانگ دەرکردن و خۆدەرخستن هۆیەکە لە هۆیەکانی دان پێ نانی بەدرۆ، بەتایبەتی لەو کێشانەی کە بایەخێکی زۆری پێ دەدرێت لەلایەن ڕاگەیاندن، یاخو کەسی تاوان بەرامبەر کراو، کەسێکی بەناوبانگە و پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزی هەیە، هەربۆیە دان پێ نان، بەئەنجامدانی ئەو تاوانە لەلایەن کەسێك وای لێ دەکات بەناوبانگ بێت و دەزگا ڕاگەیاندنەکان باسی لێوە بکەن.

5- هەندێ جار کەسێکی بێ تاوان تۆمەتبار دەکرێ بە ئەنجامدانی تاوانێك و بەڵگەیەکی زۆر لەسەری کۆدەبێتەوە و هەرچەند سەیری خۆی دەکات دەربازبوونی زۆر زەحمەتە، هەربۆیە پەنا بۆ دان پێنان دەبات لەگەڵ ئەوەی کەبێ تاوانە، بە ئومێدی ئەوەی ئەم دان پێنانە ببێتە هۆیەك بۆ سووك کردنی سزا لەسەری.

6- هەندێ جار کەسێکی نەخۆش کە چەند کێشەیەکی عەقلی و دەروونی هەیە، پاڵەپەستۆ لەسەر خودی خۆی دەکات و وای بۆ دەچێ کە ئەو تاوانی کردووە، بەڵام لە ڕاستیشدا هیچ تاوانی نەکردووە، ئەمەش پێی دەگوترێ (الاعتراف المرضی) بۆنموونە : ژنێکی نەخۆش کاتێ پیاوێك لەبازاڕ دەبینێ و سەرنجی ڕادەکێشێ (بۆنمونە ئەم ژنە ئەم پیاوەی پێ جوانە) لێرەدا ئەم ژنە نەخۆشە خۆی وا دێتە پێش کەخیانەتی لەگەڵ مێردەکەی کردوە هەر بۆیە دان بەو تاوانەدا دەنێ کە گوایە کردوویەتی .

## دەسەڵاتی دادگا لە هەڵسەنگاندنی دان پێنان

## (سلطة المحاكمة في تقدير الإعتراف)

دان پێنان، بەو پێیەی بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی سەلماندن، دەچێتە ژێر هەڵسەنگاندنی دادگا، جا بۆی هەیە پشت بەم دان پێنانە ببەستێت و پێی وەرگری، لەهەمان کات دا بۆی هەیە پێی وەرنەگرێ، چونکە هەروەك باسمان کرد، ڕەنگە ئەم دان پێ نانە دروست نەبێ، هەربۆیە دادگا ئازادە لەڕووی هەڵسەنگاندنی ئەم دان پێنانە تاوەکو قەناعەت لەلای دروست بێ.

لێرەدا پرسیارێك دەکەین : ئایا دان پێنان بەتەنها بەسە بۆ دەرچوونی حوکم بەسەر تۆمەتبار ؟ بەواتایەکی تر : ئایا دادگا دەتوانێ بەتەنها پشت ببەستێ بە دان پێ نان بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ بەڵگەکانی تر ؟

لەڕاستیدا بڕگەی (ء) لەماددەی (181) ی یاسای (أ ، م ، ج) جیاوازی کردووە لە نێوان دووحاڵەت : -



یەکەم : ئەگەر هاتوو دادگا قەناعەتی لا دروست بوو کە دان پێنانەکە ڕاستە ئەوا بۆی هەیە تەنها پشت بەم دان پێنانە ببەستێ بێ ئەوەی پێویستی بە بەڵگەکانی تر هەبێ.

دووەم : ئەگەر هاتوو دەرکەوت بۆ دادگا کە ئەم دان پێ نانە عەیب دارە و یاخود تاوانەکە لەو تاوانانەی کە سزایەکی لەسێدارەدانە، ئەوا لێرەدا ناتوانێ تەنها پشت بەو دان پێ نانە ببەستێ، بەڵکو دەبێ گوێ لە شایەدەکان و بۆ بەڵگەکانی تر بگەڕێتەوە.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە یاسای عێراقی سەرکەوتو نەبووە لە دیاریکردنی حاڵەتی یەکەم، واتا ڕێگەدان بە دادگا کە پشت ببەستێ بەدان پێنان بەتەنها، چونکە ئەمە وادەکات هەمان چەمکی کۆن بگەڕێتەوە کە دان پێنان ((گەورەی بەلگەکان)) بوو ((سيد الأدلة)) بوو، هەروەها پێویستە دادگا قەناعەت خۆی لەسەر بنەمای بابەتی و بارودۆخی تاوانەکە دروست بکات بە شێوەیەکی گشتی و هەمە لایەنە، نەك تەنها پشت بەستن بە دان پێنانی تۆمەتبار بۆ دروست بوونی ئەم قەناعەتە لەلای دادگا.

جالێرەدا پێویستە لەسەر لێکۆڵێوەر یان دادوەری لێکۆڵینەوە، تەنها بەوە نەوەستن کەدان پێ نان لەتۆمەتبار وەرگرن، بەڵکو پێویستە ئەم دان پێ نانە بەهێز بکەن لەڕێگای بەدەست هێنانی چەند بەڵگەیەکی تر، تاوەکو دان پێ نان تەنها بەڵگە نەبێ بۆ سەلماندنی کێشەکە.

لێرەشدا ،پرسیارێکی تر سەر هەڵدەدات : ئایا دادگا لەکاتی پشت بەستن بەدان پێ نان، بۆی هەیە ئەم دان پێنانە بەس بەس بکات، واتا ئەو بەشە وەرگرێت کە پێ ڕاست و درووستە و واز لە بەشەکەی تر بهێنێ ؟ یان بۆی نیە وابکات، بەڵکو دەبێ بە هەمووی وەرگرێ؟

ماددەی (219) ی یاسای (أ ، م، ج) دا هاتووە، کە دادگا بۆی هەیە لەکاتی هەڵسەنگاندنی دان پێنان، کە ئەم دان پێنانە بەش بەش بکات و ئەو بەشە وەرگرێت کە پێی ڕاستە و قەناعەتی پێ دێت ... بەلام ئەگەر هاتوو ئەم دان پێ نانە تەنها بەڵگە بوو لەسەلماندنی کێشەکە، ئەوا دادگا ناتوانێ ئەم دان پێنانە بەش بەش بکات، بەڵکو دەبێ بەگشت دان پێ نانە وەرگرێ.

بۆنموونە : کاتێ تۆمەتبار دان بە تۆمەتەکە دەنێ و دەڵێ: من تاوانی کوشتنەکەم ئەنجام داوە بەلاّم لە حاڵەتی بەرگری شەرعی بوومە بۆ پاراستنی گیانی خۆم .

لێرەدا ، دادگا دەتوانێ ئەم دان پێنانە بەش بەش بکات، وەبۆی هەیە تەنها ئەو بەشەی لێ وەرگرێت (من تاوانی کوشتنەکەم ئەنجام داوە) وە بەشەکەی تر لابدات و پێی وەرنەگرێ کە دەڵێ لەحاڵەتی بەرگری شەرعی بوومە بۆ پاراستنی گیانی خۆم، بەلاّم دادگا بۆی نیە ئەم دان پێنانە بەش بەش بکات ئەگەر




تەنها بەڵگەبوو لەسەر کێشەکە، بەڵکو دەبێ دان پێنانەکە بە تەواوەتی وەرگرێ، هەروەك چۆن دەرچووە لە لایەن تۆمەتبار.

## ڕەتکردنەوەی تۆمەت لەلایەن تۆمەتبار

## (إنكار التهمة من قبل المتهم)

پێناسەی نکۆڵی تاوان بار :-

ئەگەر هاتو تۆمەتبار ئەو تۆمەتەی ڕەتکردەوە کە ئاڕاستەی کراوە ئەوە ئەم ڕەتکردنەوە لە دووحاڵەت دەرناچێ: 1- یان ڕەتی تۆمەتەکە دەکاتەوە بێ ئەوەی بەڵگە بهێنێتەوە بۆ ئەم ڕەتکردنەوەی، 2- یان ئەوەتا ڕەتی تۆمەتەکە دەکاتەوە لەگەڵ هێنانەوەی بەڵگە بۆ ئەم ڕەت کردنەوەیە.

جا لە حاڵەتی یەکەم، ئەگەر هاتوو تۆمەتبارەکە تۆمەتەکەی ڕەتکردەوە بێ ئەوەی بەڵگە بهێنێتەوە بۆ ئەم ڕەتکردنەوەیە، پێویستە لەسەر لێکۆڵێوەر پرسیاری لێ بکات لەبارەی ئەو بەڵگانەی کە دەیسەلمێنن کە تاوانی نەکردوە ، ئینجا پرسیاری ئاڕاستە بکات کە کاتی ئەنجامدانی تاوان لەچ شوێنێك بووە ؟ ئینجا گفتوگۆی لەگەڵ بکات سەبارەت ئەو بەڵگانەی کە لەدژی کۆکراوەتەوە وەکو : دۆزینەوەی ماڵە دزراوەکە لە ماڵەکەی ، بوونی خوێن لەسەر جل و بەرگەکانی بوونی برین و زام لەسەر جەستەی، یان بوونی شوێن پەنجە و شوێن پێی لە شوێنی ڕوودانی تاوانەکە ... هتد .

ئینجا لێکۆڵیوەر دەبێ لەو وەڵامانەی تۆمەتبار بکۆڵێتەوە کە لەئەنجامی ڕەت کردنەوەی تۆمەتەکە هاتۆتە کایەوە، وە ئەگەر هاتوو لێکۆڵێوەر تێبینی بوونی (تناقض) ی کرد لەقسەکانی تۆمەتبار، پێویستە پرسیار لە تۆمەتبار بکات سەبارەت بوونی ئەم(تناقض)ە لە قسەکانی.

وە ئەگەر هاتوو تۆمەتبار هەر بەردەوام بوو لەسەر ڕەتکردنەوەی تۆمەت پێویستە لەسەر لێکۆڵێوەر پرسیاری لێبکات لەسەر بوونی شاهێد لەدژی ئەو، وە ئاخۆ بۆچی ئەم شاهێدانە ئامادەن شایەدی لەدژی بدەن ؟ وە ئەگەر ووتی ئەوانە درۆدەکەن، پێویستە لێکۆڵێوەر بپرسێ لێی : هۆی ئەم درۆکردنە چی یە ؟ یان هۆیەکانی درۆکردنی شاهێدەکان لەدژی ئەوچین ... ، وەئەگەر لێکۆڵێوەر بە پێویستی زانی، ئەوا بۆی هەیە شاهێدەکان ڕووبەڕووی تۆمەتبار بکاتەوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بەڵام دەبێ دەرئەنجامی ئەم ڕووبەڕووبونەوەیە لە(محضر ) بنووسێت، لەگەڵ دیاریکردنی هەر تێهەڵچوون و کاریگەریەك کە بەسەر شاهێدەکان و تۆمەتبار دا دێت لەکاتی ئەم ڕوو بەڕوو بونەوەیە.




وە حاڵەتی دووەم ئەگەر هاتو تۆمەتبار ڕەتی تۆمەتەکەی کردەوە، بەلام بەلگەی بۆئەم ڕەتکردنەوەیە هێنایەوە، واتا بەلگەی هێنایەوە بۆ ڕەت کردنەوەی تۆمەتەکە لەسەر خۆی، بۆنمونە: بیسەلمێنێ کە ئەو کەسە لە شوێنێکی دیاریکراو بووە لەکاتی ڕوودانی تاوانەکە ، یاخود بیسەلمێنێ کە یەکێ لە شاهێدەکان یان دوو لەشاهێدەکان پێشتر ڕق و ناخۆشیان لەگەڵی هەبووە .... هتد ، لێرەدا پێویستە لێکۆڵێوەر پەلە بکات لە لێکۆڵینەوەی ئەم بەلگانە تاوەکو لەڕاستی ئەم بەلگانە بگات، هەروەها پێویستە لەسەری کە گوێ لەو شاهێدانە بگرێ کە بەرگری لە تۆمەتبار دەکەن کە تۆمەتبار داوای کردوون بۆ شایەدی دان لەبەرژەوەندی ئەو، لەگەڵ هەر ڕێوشوێنێکی تر بەمەبەستی گەیشتن بە ڕاستیەکان.

وەلەکاتی وەلام نەدانەوەی ئەو پرسیارانەی کە ئاڕاستەی تۆمەتبار دەکرێ سەبارەت بەو تۆمەتەی کە ئاڕاستەی کراوە، پێویستە لەسەر لێکۆڵێوەر هەولبدات کە ئامۆژگاری بکات کە بەرگری لەخۆی بکات و لەبوونی بەلگە لەدژی ئاگاداری بکاتەوە ، جا ئەگەر هەر بەردەوام بوو لە سەربێ دەنگ بوون سەرەڕای ئامۆژگاری کردنی، لێرەدا دەبێ لێکۆڵێوەر ئەم بێ دەنگیە لە (محضر)ی لێکۆڵینەوە دیاری بکات.

## شارەزایان و ئاسەواری تاوانکارییەکان

## (الخبراء والآثار الجرمية)

**یەکەم : شارەزایان :-**

لەکاتی ئێستا، شارەزایان ڕۆڵێکی گرینگ دەبینن لە کارەکانی لێکۆڵینەوەی تاوانکاری، ئەویش لەڕێگای پێشکەشکردنی یارمەتی بۆ لێکۆڵێوەران، بۆ ئاشکراکردنی لایەنە نادیارەکانی تاوان بە شێوازێك کە پشت بە زانست و لێکۆڵینەوە و شی کردنەوەی ئاسەوارەکان کە بۆیان ڕەوانە دەکرێ.

**شارەزا (الخبير)** :- کەسێکە خاوەن شارەزاییەکی زانستی و هونەرییە، وە ئەم شارەزاییە یان لەڕێگای خوێندن و توێژینەوەی زانستی دەست کەوتوە، وەکو پزیشکی شەرعی، شیکەرەوەی بایۆلۆجی یان کیمیاویی (المحلل البايولوجي أو الكيمياوي) یان ئەوەتا لەڕێگای بەردەوام بوونی لەپیشەیەکی دیاریکراو بۆ ماوەیەکی زۆر ئەم شارەزاییەی دەست کەوتووە، وەکو خاوەن پیشەکان، وەکو دارتاش ، ئاسنگەر ... هتد .

جا لەبەر گرنگی ڕۆڵی شارەزا لەبواری لێکۆڵینەوە، یاسا ڕێگەی داوە بەدادوەری لێکۆڵینەوە یان لێکۆڵێوەر داوای هێنانی شارەزایەك یاخود زیاتر لە شارەزایەك بکەن تاوەکو ڕای خۆی دەربڕێ سەبارەت بەو








مەسەلەی کە داوای لێ کراوە، هەروەها هەندێ جار یەکێ لە هاودژەکان (أحد الخصوم) بۆی هەیە داوای هێنانی شارەزا بکات و پرسی پێ بکرێ سەبارەت بە کێشەیەك ، بۆنموونە : تۆمەتبار دەتوانێ داوا لەدەسەلاتی لێکۆڵینەوە بکات پرس بە شارەزا بکرێت سەبارەت بەو کەرەستەی کە تۆمەتبارکراوە پێی بۆ زانین کە ئاخۆ ماددەی بێ هۆشکەرە یاخود نا، جێی باسە دەسەلاتی لێکۆڵینەوە بۆی هەیە ئەم داوایە ڕەت بکاتەوە ئەگەر هاتوو بەگرینگی نەزانی ئەم شتە یاخود ئەم کەرەستەیە پیشانی شارەزا بدات، بەلام دەبێ هۆی ئەم ڕەتکردنەوەیە ڕوون بکاتەوە **لە** (محضر) ی لێکۆڵینەوە .

هەروەها دادوەر یان لێکۆڵێوەر بۆیان هەیە ئامادەبن لەکاتی هەستانی شارەزایان بەکارەکەی، یان دەکرێ شارەزا بانگ بکرێت بۆ شوێنی کارکردنی دادوەر یان لێکۆڵێوەر بۆئەوەی ئەم کارەی پێ ڕاسپێردراوە لەم شوێنە بیکات، هەروەها هەندێ جار دەکرێ شارەزا تەنها ڕاپۆرتێك ئامادە بکات سەبارەت ئەو بابەتەی کە پێی سپێردراوە و ڕەوانەی بکات بۆ دەسەلاتی لێکۆڵینەوە.

وە لەبەر گرینگی لێکۆڵینەوە لەو تاوانانەی کە لەجۆری(جنایات جنحە)ن ، ئەوا ماددەی (70) لەیاسای (أ ، م ، ج) ڕێگەی داوە بە دادوەری لێکۆڵینەوە یان لێکۆڵێوەر کە تۆمەتبار یان کەسی تاوانبەرامبەر کراو ناچار بکات تاوەکو پشکنین لەسەر جەستەی ئەنجام بدرێت وە ڕێگای وەرگرتنی وێنە یان پەنجەی دەست یان کەمێك خوێنەکەی یان قژی یان نینۆکی هەر شتێکی تر کە سوودی هەیە بۆ لێکۆڵینەوە.

جێی باسە ، شارەزا دەتوانێ پاش ڕەزامەندی لێکۆڵێوەر سەیری پەڕاوگە و (محاضر)ی لێکۆڵینەوە بکات تاوەکو سوودیان لێ وەرگرێ لە کارەکەی، بەلام ڕۆڵی شارەزا تەنها بریتی نیە لەدەربڕینی ڕای خۆی سەبارەت بەو مەسەلانەی کە خراوەتە بەردەمی، بێ ئەوەی ئەم سنوورە ببەزێنێ، واتا بۆی نیە ڕای خۆی بدات سەبارەت هەستانی تۆمەتبار بەئەنجامدانی تاوان، یاخود تۆمەتبارکردنی کەسێك، چونکە ئەمە کاری دەسەلاتی لێکۆڵینەوەیە.

هەرچەند لەیاسی (أ ، م ، ج) هیچ دەقێکی یاسای تێدا نییە کە دەبێ شارەزا سوێند بخوات پێش ئەنجام دانی کارەکەی، بەلام بەپێی ماددەی (10) لە یاسای (قانون الخبراء امام القضاء العراقي) ژمارە(163) ی ساڵی 1964، دەبێ شارەزا پێش ئەنجامدانی کارەکەی لەبەردەم لێژنەیەکی تایبەتمەند سوێند بخوات.

جێی وەبیر هێنانەوەیە، کە تۆمەتبار و هاودژەکانی تر، بۆیان هەیە داوای ڕەتکردنەوەی شارەزابکەن (رد الخبير)، ئەویش بە پشت بەستن بە چەند هۆیەك، وەکو بوونی پەیوەندی خزمایەتی نێوان شارەزا و










یەکێ لە هاوڕێکان، یان بەهۆی ناپاکی ئەم شارەزایە(عدم النزاهة)، جا پێویستە لەسەر دەسەڵاتی لێکۆڵینەوە ئەم داوایە تاوتوێ بکات و هەڵی بسەنگێنێ، وە ئەگەر قەناعەتی پێ هات ئەوا قەبوولی دەکات، ئەگەر نا ڕەتی ئەم داوایە دەکاتەوە.

لێرەدا پرسیارێك دێتە کایەوە : ئایا هێزی یاسایی ڕای شارەزا چەندە ؟

بەواتایەکی تر: ئایا دادگا پەیوەست دەکات کەپێی وەرگرێ، یاخود وەکو هەر بەڵگەیەکی تر دادەنرێت و دادگا بۆی هەیە ڕەتی کاتەوە ؟

زۆربەی زۆری زانایانی بواری تاوانکاری بۆئەوە دەچێ کە ڕای شارەزا دادگا پەیوەست ناکات پێی وەرگرێت، بەڵکو تەنها چەند زانیاریەکە و دادگا بۆی هەیە پشتی پێ ببەستێ و بۆی هەیە ڕەتی بکاتەوە.

بەڵام هەندێکی تر لەزانایان پێیان وایە ، کەڕای شارەزا بریتی نیە لەتەنها چەند زانیاریەك، بەڵکو وەکو شایەدان وایە، هەرچەند جیاوازیەك هەیە لەنێوان ڕای شارەزا و شاهێد کە خۆی لەم خاڵانە دەبینێتەوە:

1- شاهێد ئەو شتانە باس دەکات کە بەیەکێ لە هەستەکانی زانیوویەتی، هەربۆیە بۆی هەیە تۆمەت بخاتە سەر شانی کەسێك(شهود الاتهام)، بەڵام شارەزا تەنها ڕای خۆی دەردەبڕێ لەسەر مەسەلەیەك کە هاتۆتەپێشی بۆیە بۆی نییە تۆمەت بخاتە سەر شانی هیچ کەسێك.

2- شاهێد کەسێکە بارودۆخی تاوان ئەم صفتەی پێدراوە، واتا تاوانێك بە صفتەی داوە بەکەسێك، بەڵام شارەزا کە سێکە پەیوەندی نیە بەو تاوانە، بەڵکو تەنها ڕایەکی زانستی یان هونەری دەردەبڕێ سەبارەت بەمەسەلەیەك داوای لێ کراوە ڕای خۆی بدات بەرامبەری.

3- هۆی بوونی شاهێد ئەوەیە زانیاری هەیە بەتاوان و بارودۆخی تاوان، هەربۆیە ناکرێ بگۆڕدرێت بە کەسێکی تر، بەڵام شارەزا لەلایەن لێکۆڵێوەر یاخود دادوەر دادەنرێت، هەربۆیە دەکرێ بگۆڕدرێت بە شارەزایەکی تر لە هەمان بواری زانستی و هونەری.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کەڕای شارەزا بریتی نیە لە تەنها چەند زانیارییەك یاخود وەکو کەسێکی شاهێد، بەتایبەتی لەچەرخی ئێستاو بەهۆی ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژی و زانستیانەی کە ئێستا جیهان بەخۆیەوە دەبینێ، هەربۆیە ئێمە ڕامان وایە کەڕای شارەزا، بەتایبەتی لەو مەسەلانەی کە پەیوەندیان




هەیە بەو لایەنانەی کە زانست دەری خستووە کە مەودای ڕاستی زانیارییەکان زۆر فراوانە، وەکو پشکنینەکانی DNA، پێویستە لەسەر دادگا پێی وەرگرێت و لێی لانەدا، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو ئەم کارە بەشێوەیەکی بێ لایەن و دادپەروەرانە ئەنجام درا.

جا دەبێ شارەزا ڕای خۆی سەبارەت بە مەسەلەیەک کەداوای لێ کراوە ڕای تێدا دەبڕێ، بەشێوەیەکی نوسراو پێشکەش بەلایەنی لێکۆڵینەوە بکات پاش واژوو کردن لەسەری، تیایدا ئەو کارانە باس بکات کەپێی هەستاوە و ئەو دەرئەنجامەی پێی گەیشتوە، لێرەدا لێکۆڵیوەر ئەم ڕاپۆرتە هاوپێچ دەکات لەگەڵ پەڕاوگەی لێکۆڵینەوەکە، هەروەها دەکرێ شارەزا ڕای خۆی بەشێوەیەکی زارەکی دەربڕێ لەبەردەم لێکۆڵیوەر بەڵام لەم حاڵەتە پێویستە لەسەر لێکۆڵیوەر ئەم ڕایە لە(محضر )ی لێکۆڵینەوە بنووسێتەوە و ئینجا لێکۆڵێوەر واژووی لەسەر بکەن.

لەبەر گرنگی ڕۆڵی شازا لە ئاشکراکردنی تاوان، زۆربەی دەوڵەتان چەند دەستەیەک و بەڕێوەبەرایەتیەکی تایبەت بە شارەزایان دروست کردووە، وەکو ئەوانەی خوارەوە :-

1- **پزیشکە دادگەریەکان**(الاطباء العدليون)

2- **شارەزایانی پەنجە مۆر و شوێن پێ**(الخبراء بطبعات الاصابع وآثار الاقدام)

3- **شارەزایانی چەک**

4- **شارەزایانی شێوازی تاوان.**

5- **شیکارییەکانی بواری کیمیاوی.**

6- **چەندین تایبەتمەندی و پسپۆڕی تر...**

## پەنجە مۆرەکان

### (طبعات الاصابع)

پەنجە مۆر شێوازێکی زۆر گرنگ و کاریگەرە بۆ زانینی کەسایەتی مرۆڤ، هەربۆیە لەسەرووی گشت ڕێگاکانی ناسینەوە کەسایەتی دێت، لێرەدا دەتوانین پێناسەی پەنجە مۆر بکەین بەوەی : بریتیە لە کۆمەڵێك هێمای بەند و لەتەك ئەم هێما بەرزانە چەند هێمایەکی نزمتر هەیە، کە بەچەندین شێوە دەردەکەوێ لەپێست ی مرۆڤ وەکو پەنجەکانی دەست و ناولەپی دەست، هەروەها لەسەر پەنجەکانی قاچ و



ناولەپی قاچ، وە ئەم هێمایانە ئاسەوار بەجێدێڵن لەسەر شت و کەرستەکان لەوکاتەی کە بەم شتانە دەکەون.

وەم پەنجە مۆرە بەلەدایك بوونی کەسێك جێگیر دەبێ تا ئەوکاتەی دەمرێت، وە هێما بەرزەکانی پەنجەکان چەندین ڕێژین (غدة) دەردەدەن کە لەکاتی پێکەوتن بەشتەکان (بەتایبەتی لووسەکان (الملساء)) ئەوا شوێنی خۆی جێ دەهێڵێ لەسەر ئەم شتانە ، بەلام هێما(نزم) کان کە لەکۆتاییەکانی دەماری هەست کردنە، ئەوا لەڕێگایە دەتوانین هەست(حس) بەشتەکان بکەین کاتێ دەست لەم شتانە دەدەین.

## (تایبەت مەندییەکانی پەنجەمۆ)

## (خصائص البصمات)

پەنجە مۆر چەندین تایبەتمەندی هەیە، ئەمانەی کەباسیان دەکەین گرینگترین ئەو تایبەتمەندیانەن :-

### 1- جێگیر بوونی پەنجەمۆر لەگەڵ ژیانی مرۆڤ(مدى الحياة):-

وێنەی هێڵکاری بەرزو نزمی پەنجەکان پارێزگاری لە شێوە و شێوازەکەی دەکات لەو کاتەی کە مرۆڤ لەدایك دەبێ بەردەوام دەبێ لە قۆناغەکانی منداڵی و لاویەتی و پیربوون تەنانەت پاش مردنیش تا ئەوکاتەی جەستەی مرۆڤ تووشی شی کردنەوە(تحلل) دەبێ، وە تاکە شتێك هەیە کا لەپەنجە مۆردەکات، ئەویش ئەوەیە کە پەنجەمۆر گەشە دەکات لەگەڵ گەشەکردنی پەنجەکان، وەکو گشت ئەندامەکانی تری مرۆڤ کە گەشەدەکات لەوکاتەی کە منداڵە و گەورە دەبێ، بەلام ئەم گەشە کردنە هیچ زیادکردنێك یاخود کەم کردنێك دورست ناکات لەسەر ژمارەی هێڵکارییەکانی پەنجەمۆر یاخود کاریگەری نیە لەسەر تایبەتمەندیەکانی ئەم پەنجانە.

2- **پەنجە مۆر گۆڕانکاری بەسەر نایە** :- ئەو هێڵکاریانەی کە لە پەنجەمۆر دا هەیە گۆڕانکاریان بەسەر نایە، بۆنموونە، ئەگەر هاتوو پارچەیە دەرەکی (خارجي) پێست تووشی زامداربوون هات و بووە هۆی تێکچوونی هێڵکارییەکانی پەنجە، ئەوا ئەم هێڵکارییانە جارێکی تر سەر لەنوێ سەرهەڵدەدەنەوە وەکو جاران لەکاتی چاك بوونەوەی زامەکە بەبێ گۆڕان لە هەمان شوێندا، بەلام ئەگەر پارچەی ژێر پێست تووشی زامداربوون هات، ئەوا ئاسەوارەکەی دەمێنێتەوە و ناتوانرێ لابرێت، هەروەها پەنجەمۆر




ڕەنگە تێك بچێت بەهۆی هەندێ نەخۆشی ترسناك کە تووشی پێستی مرۆڤ دەبێت وەکو نەخۆشی (جذام).

## 3. لێک نەچوونی چەنجە مۆر لە نێوان دووکەسی جیاوازدا.

پەنجە مۆر بەهیچ شێوەیەك لێك ناچێت لەنێوان دووکەسی جیاوازدا، تەنانەت لێك ناچێ لە نێوان دوو (جمك / توأم)، بەڵکو هەریەك لە مرۆڤەکان پەنجەمۆری تایبەت بەخۆی هەیە لە ڕووی خاڵ و نیشانە و هێڵکاری تایبەتمەند.

هەربۆیە پەنجە مۆر چەندین جۆری هەیە، کە تاوەکو ئێستا زانایانی تایبەت بەم بوارە کۆك نین لەم ڕووە وە، بەڵام تاقیکردنەوەکان دەریان خستووە کە جۆرەکانی پەنجە مۆر چوار جۆرن بەم شێوەیە :

(المقوسات ، المنحدرات ، المستديرات ، المركبات)

جا ئەم چوار جۆرە لە دوو شێوە دەتوانین دابەشی بکەین :-

1-**پەنجە مۆرە دیارەکان** (الظاهرة) 2- **پەنجە مۆرە نادیارەکان** (الخفية) .

1. **پەنجە مۆرە دیارەکان** :- ئەو پەنجەمۆرانەن کە لێکۆڵێوەر یاخود شارەزا دەتوانێ بەچاوی ئاسایی بیانبینێ بەشێوەیەکی ئاسان لەکاتی( معاينة) کردنی شوێنی ڕوودانی تاوانەکە، وەکو : پەنجەی سواق دراو بەخوێن.
2. **پەنجە مۆرە نادیارەکان(الخفية)** :- ئەو پەنجە مۆرانە بەچاوی ئاسای نابینرێت بۆنموونە : ئەو کاتەی پەنجەمۆر لەسەر کاغەز بەجێ دەمێنێ، بەڵام لەهەندێ حاڵەت دەکرێ ئەم پەنجەمۆرە ببیندرێت لەوکاتەی کە لەسەر شتێکی سادە دەبێ وەکو جام(الزجاج)، وەهەندێ کەرستەی (زخرف)

## گەڕان بەدوای چەنجەمۆر لە شوێنی تاوان

لەکاتی گەڕان بەدووای پەنجەمۆر لەشوێنی ڕوودانی تاوان، پێویستە لەسەر لێکۆڵێوەر پلانێکی تۆکمە داڕێژێ بۆ ئەم مەبەستە، جاسەرەتا دەبێ بزانێ تۆمەتبار لەکوێ چووەتە ئەم شوێنە و لەکوێ هاتۆتە دەرەوە، پاشان بە دووای هەنگاوەکانی تاوانبار بڕوات و پشکنین ئەنجامبدات لەسەر گشت ئەو شتانەی کە پەرش و بڵاو کراونەتەوە لەسەر زەوی، وەکو شوشە(جام) و پەڕاوگە و کەرستەکانی تر، وە دەبێ زۆر




بەوردی پارێزگاری لەم شتانە بکات و نەهێڵێ تێکەڵی یەکتر بن، چونکە هەروەك دەزانین، کە گەڕان بەدووای بەڵگەکان تەنها دۆزینەوەی کەسایەتی تۆمەتبار، وەکو (قژ ، جل و بەرگ، خوێن، ... هتد)

وەکاتی لێکۆڵێوەر شوێن پەنجە دەدۆزێتەوە لە شوێنی ڕوودانی تاوان، پێویستە لەسەری دڵنیابێ لەوەی کەئەم پەنجە مۆرە هی تاوانبارە نەك کەسێکی تر یان کەسانێکی تر کە لەم شوێنەدان یاخود هاتوو چۆی ئەم شوێنە دەکەن، ئەویش لەڕێگای وەرگرتنی پەنجەمۆری ئەم کەسانە ئینجا بەراوورد بکرێت لەگەڵ ئەو پەنجەمۆرەی کە لە شوێنی ڕووداوەکە دۆزراوەتەوە، بۆ دڵنیابوون لەوەی کە ئەم پەنجەمۆرە هی ئەم کەسانە نییە.

## گواستنەوەی پەنجەمۆر (نقل البصمه) :-

زۆرجار ئەوشتانەو ئەو کەرەستانە کە پەنجە مۆریان لەسەرە ڕەوانەی دەکرێن بۆ نوسینگەی بەدوواگەڕان(شعبة التحريات) بەشی (شوێن پەنجەکان)، بەڵام ئەگەر ئەم کارە نەکرا یاخود بووە هۆی شێواندنی شوێن پەنجەکان، بۆنموونە : ئەگەر شوێن پەنجەکە لەسەر دیوار بوو یاخود لەسەر شتێکی گەورە و قورس بوو، ئەوا لەم حاڵەتە پێویستە پەنجەمۆرەکە بگوازێتەوە بۆ ئەم نووسینگەیە جا سەرەتا دەبێ شوێنی پەنجە مۆرەکە بەدیار بخرێت لەڕێگای بەکارهێنانی هەندێ (مسحوق) ی تایبەت، ئینجا پارچەیەکی(لاصق) دەهێندرێت کە تایبەتە بەم ڕێ و شوێنە، ئینجا پارچەیەکی تەنك(رقيق) کەلەسەر ئەم (لاصق)ە دا هەیە لا دەبرێت و پاشان (لاصق)ەکە بەهێمنی و لەسەر خۆیی دەخرێتە سەر شوێن پەنجەکە و (ضغط)دەکرێ لەسەری، پاشان لەیەك لاوە ئەم (لاصق)ەکە بەهێمنی بەرز دەکرێتەوە و پارچە تەنکەکەی لەسەر دادەنرێتەوە بەمەستی پاریزگاری لێ کردن لە شوێن پەنجە، جا بەم شێوەیە ئەم شوێن پەنجەیە ڕوانە دەکرێ بەمەبەستی وێنەگرتن و پشکنین و بەراوورد کردن.

## سوودەکانی پەنجە مۆر :-

**1- پەنجە مۆر ئامرازێکی گرینگە بۆ لێکۆڵینەوە لە کەسایەتی تاوانباران و بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی سەلماندن لەبواری تاوانکاری.**

**2- دیاریکردنی کەسایەتی یان ناسنامەی ئەو کەسانەی کە بەهۆی ڕووداوە سروشتییەکان و جەنگەکان دەمرن .**

**3- سەلماندنی بەڵگەکان لەلایەن ئەو کەسانەی کە نەخوێندەوارن.**








هێزی یاسای پەنجەمۆر لە سەلماندن : -

پەنجە مۆر لەکاتی ئێستادا، بەبەڵگەیەکی ماددی دادەنرێت لە سەلماندنی تاوان، لەگشت وولآتانی دونیا، وە دەکرێ دادگا پشتی پێ ببەستێ لەکاتی دەرکردنی حوکمی دادگا، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا، دەچێتە ژێر هەڵسەنگاندنی دادگا و بڕیار لەسەر ئەوە دەدات کە پشتی پێ ببەستێ یاخود نا، هەربۆیە سەیر دەکەین، کە دادگاکانی عێراق پەنجەمۆریان بەیەکێ لەو بەڵگانە داناوە کە دەکرێ پشتی پێ ببەسترێت لەکاتی حوکم دان، بەلآم زۆرجار ئەم دادگایانە داوای گوێ گرتن لە شایەدی شارەزای پسپۆر لەپەنجەمۆر دەکەن سەبارەت بە چۆنییەتی ئەنجامدانی کارەکەی و چۆنیەتی بەراوورد کردن لەنێوان شوێن پەنجەکان.

## شوێن پێ یەکان

## (آثار الأقدام)

شوێن پێ، واتا ئەو شێوەیەی کە پێ بەجێی دەهێڵێت لەو شوێنەی کە دەنگی لەسەری و کاریگەری بەسەر جێ دەهێڵێت، وەکو خۆڵ ، قوڕ، یاخود لەسەر شتێکی تر، لەوکاتەی کە شوێن پێ بە کەرستەیەکی(مواد)دەنێ، وەکو خوێن یاخود ئاو یاخود خۆڵ.

زۆر جار کاتێ تۆمەتبار تاوانەکەی ئەنجام دەدات، پێویستی بەوە هەیە کە لەشوێنێکەوە بچێتە شوێنێکی تر، جا لەم کاتەدا ئاسەواری پێی جێ دەهێڵێت، وە هەندێ جار بارودۆخ یارمەتی دەردەبێ لە دیاریکردنی ئەم شوێن پێ یە، لە ڕووی ئەو زەویەی کە تاوانبار پێی لێ دەنێت یاخود ئەو شتانەی کە دەلکێ بە پێی تاوانبار.

## شوێنی بوونی شوێن پێ

## (محل وجود آثار الاقدام)

شوێن پێ لەم شوێنانەدا هەیە :

1– **ئەو ڕێگایانەی کە دەچێت بۆ شوێنی ڕوودانی تاوانەکە، وەکو شەقام ئەو زەویانەی کە لەدەوروبەری ئەم شوێنەن.**

2–**لەگشت ئەو شوێنانەی کەوا مەزندە دەکرێت تۆمەتبار پێی ڕۆشتبێ لەناو شوێنی تاوانەکە، وەکو ماوەی نێوان ژوورەکان، قاڵدرمە(السلم)، سەربان(السطح)**




**4-ئەو ڕێگاو ڕێڕەوانەی کەوا مەزندە دەکرێ تاوانبار گرتویتەبەر بۆ دەرچوون لە شوێنی ڕوودانی تاوان لەپاش ئەنجامدانی تاوانەکە.**

جۆرەکانی شوێن پێ :

1. **شوێن پێی ڕووت** (عاري) : ئەو شوێن پێیە یە کە بەپێی خواسی یە ، واتا بێ ئەوەی هیچ شتێك پێ دابپۆشێ.
2. **شوێن پێی دەور دراو بەشت**(محتذي): ئەو شوێن پێ یەیە کە داپۆشراوە بەشتێك، وەکو : گۆرەوی (جوارب) یاخود پێڵاو(حذاء)

**بوونی شوێن پێ لە شوێنی ڕوودانی تاوان یاخود لەنزیک شوێنی ڕوودانی تاوان سوود دەگەیەنێ بۆ هاتنەوەی ئەم مەبەستانە :**

1. ئاماژەیە بۆ ئەو لایەنەی تۆمەتبار تیایدا چووەتە شوێنی ڕوداوەکە، وەگەڕان و سوڕانی لەناو ڕێڕەوەکانی ئەم شوێنە، هەروەها ئەو لایەنەی کە گرتویەتیە بەر بۆ دەرچوون لەم شوێنە پاش ئەنجامدانی تاوانەکە .
2. ئاماژەیە بۆ ژمارەی تۆمەتباران(عدد الجناة) و ئەو ڕۆڵەی کە هەریەکێك لەم تۆمەتبارانە پێی هەستاون لەکاتی ئەنجامدانی تاوانەکە.
3. ئاماژەیە بۆ هەندێ صفات و تایبەتمەندی تۆمەتبار ، وەکو : لەش ساغی لە جەستەدا، کەسێکی (شەل) (أعرج)، کەسێکی (خێل) و (أعور)، کەسێکی سەرخۆش (سکران)، کەسێکی بچووکە یاخود گەورەیە لەتەمەن، لەڕووی ڕەگەزەوە نێرە یاخود مێ، .... گشت ئەمانە لەشەقاوی پێ یەکان بەدیار دەکەوێ .
4. ئاماژەیە بۆ بالآی (طول) تۆمەتبار، چونکە مرۆڤ وەکو گشت دروستکراوەکانی تر جۆرە یەکسانیەك هەیە لەنێوان ئەندامانی لەشی.

## هێزی یاسای شوێن پێ وەکو بەڵگەیەکی سەلماندن




شوێن پێ ئەو هێزە یاساییە نییە کە پەنجەمۆر هەیەتی، هەربۆیە شوێن پێ بەبەڵگەیەکی ناڕاستەو خۆ دادەنرێت کە قەناعەتی دادگا زیاد دەکا لەپاڵ بەڵگەکانی تر، چونکە شوێن پێ مەودای ڕاستگۆیی تیایدا زۆر کەمە وە تۆمەتبار دەتوانێ لەدوای خۆی شوێن پێی نادروست جێ بهێڵێ.

بەڵام ئەگەر هاتو ئاسەواری شوێن پێی(ڕووت عاری) دۆزرایەوە لە شوێنی تاوان و هێڵکارییەکانی ڕوون ئاشکرا بوون لە ڕووی تایبەت مەندی ئەو هێڵکاریانە، وەلەکاتی بەراووردکردن سەلمێندرا کە ئەم شوێن پێ یە هی ئەم تۆمەتبارەیە، ئەوا لێرەدا هیچ جیاوازی نیە لەگەڵ پەنجەمۆرو هەمان هێزی یاسایی هەیە.

## شێوازە تازەکان لە لێکۆڵینەوە

## (الوسائل الحدیپە فی التحقیق)

بەهۆی ئەو پێشکەوتنە تەنکۆلۆژیایەی سەردەمی ئێستاماندا، لەڕووی زانیاری و زانستەکان، چەندین ئامێر و کەرەستەی تازە سەریان هەڵداوە ڕێگای تازەش هاتە کایەوە کە پشت لەبنەمای زانستی دەبەستێ، کە ئەمەش یارمەتی دەرێکی باش بوو بۆ لێکۆڵینەوە لەتاوان و گەیشتن بە ڕاستیەکان.

### یەکەم :- ئامێری ئاشکراکردنی درۆ: (جهاز كشف الكذب) :-

ئامێری ئاشکراکردنی درۆ : ئامێرێکە هەڵدەستێ بە تۆمارکردنی هەندێ گۆڕانکاری فیزۆلۆجی لەلاشەی مرۆڤ، کە لەکاتی لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو مرۆڤە ئەم گۆڕانکاریانە سەرهەڵدەدەن.

جا لەڕێگای خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنی ئەم گۆڕانکاریە فیزۆلۆجیانە کە ئەم ئامێرە تۆماری کردووە، دەگەینە ئەو ڕادەیەیی کەئەم کەسە ڕاست دەکات لەقسەکانی یاخود درۆ دەکات.

**اقسام جهاز**

1- بەشی هەناسەدان (قسم التنفس).

2- بەشی پاڵەپەستۆی خوێن (قسم الچغگ الدم).

3- بەشی پلەی بەرەنگاربوونەوەی پێست بۆ تەزووی کارەبا (قسم درجه مقاومه الجلد لقیاس کهربائی چعیف)

جا هەر بەشێك لەم بەشانە هەڵدەستێ بە تۆمارکردنی هەر گۆڕانکاریەك کەبەسەری دادێ و تۆماری دەکات لەڕێگای هێمای هێڵکاری کە لەسەر کاغەزێکی بزوێنەر دەردەکەوێ، لەهەر وەڵامدانەوەیەکی تۆمەتبار بۆ پرسیارەکان.



وە شێوەی ئەو پرسیارانەی کە ئاڕاستەی تۆمەتبار دەکرێت هەمەجۆرن و هەمەڕەنگن ( بۆزانیاری زیاتر بڕوانە لاپەڕەکانی (223 - 226) لە پەرتوکەکەت)

ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگ بێ لەم قۆناغەی ئێستای خوێندن وەلأمدانەوەی ئەم سێ پرسیارەیە کە تایبەتن بەم ئامێرە:

پ1/ ئایا دەکرێ کەسێك لەژێر تاقیکردنەوەی ئەم ئامێرە دابنرێت بەبێ ڕەزامەندی خۆی ؟

نەخێر، چونکە ئەمە ناگونجێ لەگەڵ سادەترین ڕێساکانی ئازادی تاکەکەس، وە دەبێتە هۆی نەمانی ماف بەرگری تۆمەتبار لەخۆی، کە ئەم مافەش یاسا پێی داوە.

## پ2/ ئایا بەهای زانستی ئەم ئامێرە چەندە ؟

لە تاقیکردنەوەکانی لێکۆڵینەوە دەرکەوتوە کە لە(50٪) کۆی ئەو حاڵەتانەی کە ئەم ئامێرە تیایدا بەکارهاتووە، تۆمەتباران دانیان بە تاوانەکانیان ناوە کاتی ئاڕاستەکردنی پرسیار بۆیان.

## پ3/ ئایا هێزی یاسایی ئەم ئامێرە چەندە لەڕووی سەلماندنەوە ؟

لەڕاستی دا، ئەم ئامێرە وەکو بەڵگەکانی پەسەندکراو دانانـدرێت لە ڕووی تاوانبار کردنی تۆمەتبار یان بێ تاوان، تەنانەت بە(قرينە)ش دانانرێت لەڕووی سەلماندنی تاوانکاری، ئەویش لەبەر چەندین هۆ، لەوانە : ڕەنگە ئەم ئامێرە هەڵەبکات، وە ئەو گۆڕانکاریە فیزیۆلۆجیەیی کە ئەم ئامێرە تۆماری دەکات مەرج نییە هۆیەکەی درۆکردنی تۆمەتبار بێ، بەلکو ڕەنگە سەرچاوەکەی ترس بێ لەم تاقیکردنەوەیە، یان نائارامی بێ(قلق)، یان ئازار بێ ... هتد ، لەپاڵ ئەمانەش هەندێ کەس (هەندێ تۆمەتبار) دەتوانن خۆڕاگربن بەرامبەر ئەم ئامێرە و کۆنترۆڵی لایەنی دەروونی جەستەیی خۆیان بکەن.

### دووەم : بەکارهێنانی کەرستەی هۆشبەر

### (إستعمال المواد المخدرة)

ئەم شێوازە، شێوازێکی تایبەتە لەشێوازەکانی شیکاری دەروونی(التحليل النفسية) لەڕێگای پێدانی بڕێك لەیەکی لەکەرەستە هۆشبەرەکان وەکو (وەکو: الإميتال ، الفاركوفين ... هتد) لەدەماری




(الوريد) تۆمەتبار، کەوای لێ دەکات جۆرە لە هۆش چوونێکی پێوە دیار بێت (الغيبوبة الواعية) بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بەشێوەیەك کە کۆنتڕۆڵی ویست و ئارەزوی خۆی لەدەست دەدات و وای لێدەکات ئەوەی لەناخیدا کۆبۆتەوە باسی بکات ، لەکاتی ئاڕاستەکردنی پرسیار بۆی، لەڕاستیدا مشت و مڕێکی زۆر لەنێوان یاسا ناسان سەری هەڵدا سەبارەت بە ڕەوایی و دروستی ئەم دان پێدانانە کە وەردەگیرێت لە ڕێگای بەکارهێنانی ئەم کەرەستە هۆشبەرانە، ڕای زۆربەی زۆری یاسا ناسانی بواری یاسیی تاوانکاری لەسەر ئەوەیە کە پێویستە ئەم شێوازە قەدەغە بکرێت لەکاتی لێکۆڵینەوە ، ئەویش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە :

1- بەکارهێنانی کەرەستەی هۆشبەر جۆریکە لە زۆر لێکردنی ماددی(الاكراه المادي) ، هەربۆیە هەر دانپێنانێك کە لە ئەدەرئەنجامی بەکارهێنانی ئەم کەرەستە هۆشبەرانە دەربچێ، ئەواهیچ بەهایەکی یاسایی نییە و ناکرێ پشتی پێ ببەسترێت وەك بەڵگەیەکی یاسایی، وە وا دادەنرێت کە ئەم دانپێنانە لەژێر ئەشکەنجەدان دەرچووە.

2- بەکارهێنانی کەرەستەی هۆشبەر، هەڕەشەیە لەماف ئادەمیزاد لە سەلامەتی لاشەو عەقڵ و کەسایەتی.

3- بەکارهێنانی ئەم کەرەستانە هەڕەشەیە لەماف تۆمەتبار لەبێ دەنگ بوون (حق المتهم في الصمت) واتا ناچار کرد لەقسەکردن لەسەر هەندێ شت کەلەبەرژەوەندی ئەودا نەبێ.

4- بەکارهێنانی ئەم کەرەستانە بوار نادات بەتۆمەت بار کەبەرگری لەخۆی بکات ، کە بەپێی یاسا ئەم مافەی هەیە.

جۆرێکی تر لە یاسا ناسان پێیان وایە کە دەکرێ ئەم شێوازە بەکاربێت ئەگەر هاتوو تۆمەتبار ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر بەکارهێنانی، بەڵام هەندێکی تر لەیاسا ناسان ڕێگەیان داوە بە بەکارهێنانی ئەم کەرەستە هۆشبەرانە، لەهەندێ تاوانی مەترسی دار، وەکو تاوانی کوشتن ، سوتاندن ، وێران کردن، تیرۆر، ... هتد ، تەنانەت ئەگەر تۆمەتبار ڕەزامەندی دەرنەبڕی لەسەر بەکارهێنانی ئەم کەرەستانە ،

**بەمەرجێک :-**

**1- بەڵگەی ڕوون و بەهێز هەبوون لەسەر تۆمەتبار کردنی ئەم تۆمەتبارە.**

**2- هەروەها دەبێ ئەم بەکارهێنانە لەلایەن شارەزایەکی پسپۆر ئەنجام بدرێت بە ئامادەبوونی پارێزەری تۆمەتبار.**








**3–دەبێ ئەم شێوازە تەنها لەحاڵەتی زەرورەت و پێویست بەکاربێت کە بەرژەوەندی کۆمەڵگا بخوازێت.**

ئەوەی تایبەت بێت بەیاسای عێراقی ئەوە ماددەی (127) لەیاسای (أ ، م ، ج) ئەوا ئەم مشت و مڕەی یەکلایی کردۆتەوە کە تیایدا هاتووە : - (نابێ هیچ شێوازێکی نارەوا)( غیر مشروع) بەکاربێت بۆکاریگەری لەسەر تۆمەتبار بەمەستی وەرگرتنی دانپیانانی ئەم تۆمەتبارە، وە بەشێوازی نارەوا دادەنرێت بەکارهێنانی : هۆشبەرەکان ، سەرخۆشەکان ، وە داوو دەرمان (العقاقیر)، هەربۆیە هەر دانپیانانێك کەدەست لێکۆڵێوەر دەکەوێت لە دەرئەنجامی ئەم مادەو کەرەستە هۆشبەرانە ئەوا دان پیانانێکی نادروستە (باطلة)

## شوێنەواری دڵۆپە خوێنەکان

## (آثار البقع الدموية)

دڵۆپە خوێنەکان، ماددەیەکی شلەیە(سائلە) کە لە شوێنی ڕوودانی تاوان دەبیرنێت، یاخود لەسەر ئەو ئامێرەی کە بەکارهاتووە لە ئەنجامدانی تاوان، یاخود دەڵێ بەلاشەو جل و بەرگی تۆمەتبار یان تاوان بەرامبەر کراو .

کەواتا بۆئەوەی ئەم دڵۆپە خوێنانە بدۆزینەوە پێویستە لەم شوێنانە بەدوای بگەڕێن:

**1–شوێنی ڕوودانی تاوان بۆنموونە: لەو ژوورەی کە تاوانەکەی تیایدا ئەنجام دراوە لەسەر جێگا، پەنجەرە، زەوی، کەرەستەکانی تر، یاخود لەناو باخچە و دار و درەختەکان ... هتد .**

**2– جل و بەرگ و لاشەی کەسی تاوان بەرامبەر کراو.**

**3– جل و بەرگ و لاشەی تۆمەتبار .**

**4– ئەو ئامێر و کەرەستانەی کە تاوانەکەی پێ ئەنجام دراوە.**

RAZ Stationery

- **چۆنییەتی پارێزگاری کردن لە دڵۆپە خوێنەکان :-**

1-ئەگەر دڵۆپە خوێنەکان لەسەر دیوارەکە بوو یان لەسەر زەوی بوو، ئەوا پێویستە هەڵبگیرێت لەڕێگای ئامێرێکی (حاد) لەسەر کاغەزێکی سپی، ئینجا بخرێتە ناو قووتوی تاقیکردنەوە(أنبوبة اختبار)



2.ئەگەر هاتوو دڵۆپە خوێنەکە لەسەر جل و بەرگ بوو، ئەوا دەبێ ئەم جل و بەرگانە بە هێمنی هەڵبگیرێ و قەد بکرێ، بەکاغەزێکی سپی دابپۆشرێت.

3. ئەگەر هاتوو دڵۆپە خوێنەکە لەسەر گیا بوو(الحشائش) ئەوا پێویستە ئەم دڵۆپانە کۆبکرێتەوە و لەناو قوتوویەکی شووشەیی دابنرێت.

4.ئەگەر لێکۆڵێوەر بۆی نەکرا ئەم دڵۆپانە بگوازێتەوە، ئەواپێویستە لەسەری ئەم کارەی جێ بهێڵێ بۆ کەسێکی شارەزا تا ئەم کارە بکات .

5.هەروەها دەبێ لەکاتی ڕەوانەکردنی ئەم دڵۆپە خوێنانە بۆتاقیگا، پێویستە چەند نموونەیەك لە خوێنی تۆمەتبار و کەسی تاوانبەرامبەر کراویش ڕەوانە بکرێت بۆئەوەی تەرازوو بکرێن لەگەڵ ئەم دڵۆپانە .

جێی ئاماژەیە کە چەندین هۆکاری سروشتی، وەکو باران و با، کاریگەری دەکەنە سەر ئەم دڵۆپە خوێنانە، هەروەها تێپەڕبوونی کات (الزمن) ڕەنگە کاریگەری خراپ بکاتە سەر ئەم دڵۆپانە، بۆیە واباشترە پەلە بکرێت لە کۆکردنەوەیان.

## هێزی یاسایی دڵۆپە خوێنەکان :-

دڵۆپە خوێنەکان لە بەڵگە ماددیەکانە، کە دەکرێ بووترێت ((دڵۆپە خوێنەکان تاوان ڕەت دەکاتەوەو نایسەلمێنێ)) چۆن ؟ ئەگەر هاتوو جۆری خوێنی تۆمەتبار جیاواز بوو لەگەڵ ئەو جۆرە خوێنەی کە لەشوێنی ڕوودانی تاوانەکە دۆزراوەتەوە، ئەوا ڕەتی ئەو تۆمەتە دەکاتەوە کە خراوەتە پاڵ ئەم تۆمەتبارە.

بەڵام ئەگەر جۆری خوێنی دۆزراو لەگەڵ خوێنی تۆمەتبار یەك جۆربوو، ئەو مانای ئەوە نییە کە تۆمەتبار تاوانەکەی کردووە، چونکە زۆر لەخەڵك ڕەنگە ئەم جۆرە خوێنەیان هەبێ، بۆنموونە: جۆری (A+ ، O- ، A- ... هتد)




